ڕۆمان

جان دۆست

# عەفرین

## ڕێڕەۆی ئارام



وریا غەفووری کردوویە بە سۆرانی



لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی

ناونیشان: هەولێر - فولکەی زەراعە - نێو پارکی وەفایی

https://www.facebook.com/mali.wafai

٠٧٥٠٤٨٣٦٦٤٧


---


جان دۆست


# عەفـــــرین

# ڕێڕەوی ئارام


وریا غەفووری

کردوویە بە سۆرانی

له بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی
ناونیشان: هەولێر - قوتابخانەی زیراعە - نزیک پارکی وەفایی
https://www.facebook.com/mali.wafai
٠٧٥٠-٤٨٣٣٦٤٧

- ناوی کتێب: عەفرین (ڕێڕەوی ئارام)
- نووسەر: جان دڵست
- وەرگێڕ: وریا غەفووری
- سەرپەرشتیاری چاپ: سۆران عەزیز
- نەخشەسازیی ناوەوە و بەرگ: زاری
- بابەت: ڕۆمان
- پیتچنین: وەرگێڕ
- چاپ: یەکەم/ ٢٠٢٠
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەرتووکخانەگشتییەکان ژمارە (١٢٨)ـی ساڵی ٢٠٢٠ـی درلوەتێ.

جان دۆست

# عەفـــــرین
# ڕێڕەوی ئارام

وریا غەفووری
کردوویە بە سۆرانی

ڕۆمان

٢٠٢٠

## دیاری بۆ ئەو منداڵانەی
## شەڕ ڕۆحی وێران کردوون

"گەلی برانۆ خودێکێ ئەز کێ وا ڕۆنادا بمرم
هوون تربا من ل کۆکا تل کن
یاجیکی تربا من بە ڕیحان کن ئەمان
یاجیکی ژ من رە ب گول کن
ئەرێ م گۆت هەڤاڵ و ئەحبابێ مـن تـنە نە لـێ تە گـۆت چیایێ کورمێنج
وەرن تربا من بپێن، دژمن و نەیارێ من پرن
ترسا منە ژ وێ ترسێ
وەرن ژ بەر سـەرێ م لاوکـێ خەلکـێ گـول و ڕیحانـا هـل کن"
گۆرایی لۆ باڤۆ – فولکلۆر – جەمیل هۆرۆ

سـپاس بـۆ هـاوڕێم موهەنـدیس سـەلاح حەنـان کە بـۆ زۆربەی زانیارییەکانی ئەم ڕۆمانە یـارمەتی دام. سپاس بۆ ئەو و هەموو ئەوانەی یارمەتییان دام.

# تەبەشیری زەرد

ئەو شەوەی کامرانی گەنج وایدەزانی خەریکە دەبێتە تەبەشیرێک، باران دەباری. دەنگی دڵۆپی باران کە دەکەوتە سەربانی خێوەت لە دەنگی تەقەتەقی تفەنگەکان دەچوو لە عەفرین، دوو ڕۆژ بەر لەوەی داگیر بکرێ.

ئەو زۆر ئارام بوو، لە نوێنەکەیدا ڕاکشابوو و خۆی ئامادە دەکرد بخەوێ.

کاتێک هێدی هێدی خلیسکایە نێو هەنگوینی خەو، کەولاوکەوڵ بوونە سەیرەکەشی دەستی پێکرد. سەرەتا لاقەکانی وشک بوون، هەستی کرد ئەنگوستی هەر دوو لاقی دادەوەرێت و وەک پارچەی تەبەشیر دەڕژێتە خوار. پاشان هەر دوو ڕانی وشک بوون، هەردوو پێکەوە نووسان و وشکبوون و بەرەو ژوور هەڵکشا، ڕانەکانی، سمتی، پیاوەتییەکەی کە وەک پارچەیەک تەبەشیری لێهاتبوو، زگی و سینگیش وشک بوون.

قامکەکانی دەستیشی وشکەوە بوون و داوەرین. وەک ئەوەی ڕەشەخەونێک ببینێ، بەڵام هیچ نەدەترسا. ئەوەندەی دەیتوانی سەری بەرز کردەوە و بە کەیفەوە سەیری ئەو کەوڵاوکەوڵ بوونەی دەکرد کە لە جەستەیدا ڕووی دەدا. ئەو گۆڕانە چێژێکی خۆشی هەبوو کە لە هیچ چێژێکی دی نەدەچوو. شتێکی نائاسایی بوو کە لەشی ببێتە تەبەشیر و خۆیشی چێژ لەمە وەربگرێ! کامیران دەیویست ئەم کەوڵاوکەوڵبوونی جەستەیە قەت ڕانەوەستێ. هیوای دەخواست زەمان لەو ساتەدا ڕاوەستێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو خۆشییە مەزنە بە قامکە تەبەشیرییەکانی بگرێ.

***

کێشەکە لە ڕۆژانی کۆچبەرییەوە دەستی پێکرد. ئەو و خالۆ عەلی تەمبوورڤان و لەیلای دایکی و ئالانی براچووکی لە گوندی شەڕان کە نزیکی سنووری تورکیایە، هەڵهاتن. ئەوان لەبەر لایەنگرانی سوپای تورک کە هێرشیان کردە سەر عەفرین هەڵهاتن و چوونە ناوەندی شاری عەفرین لە ماڵی نەعسان کە پیرەمێردێک لە خاڵۆوانی دایکی بوو، جێگیر بوون. بەڵام سوپای تورک و گرووپە چەکدارەکان گەیشتنە نزیکی خودی عەفرینیش. ئەوان ناچار بوون دیسان هەڵبێن. ڕۆژی ١٧ی ئاداری ٢٠١٨ لەگەڵ دەیان هەزار خەڵکی

مەدەنــی بە پەلە لە شــار دەرچــوون و بەرەو باشــوور هەڵهاتن.

لە ڕێدا لە نزیـک خـاڵی پشـکنینی گونـدی کـامیر، ئەو تەراکتۆرەی خێزانەکەی کامیران سواری ببوون و خاڵۆ عەلــی لێیــدەخوڕی، بــۆ وچانێــک ڕاوەســتا. هەر کە ڕاوەستا، ژنێکی دووگیان کە لەگەڵیان لە تەراکتۆرەکەدا بوو، ژان گرتی.

لەو ســاتەدا عەلــی تەمبوورڤــان ســەرنجی گەردنــی خوشــکەزاکەی دا دیتـی کە وشـکەوە بـووە و ترەکیـوە. ئەو نەیـدەزانی نەخۆشـینێک هەیە کە کالسـیۆمی زۆر لە ژێــر پێســتدا کــۆ دەبێــتەوە و پێســت وشــک و ســپی دەکــاتەوە. کــامیران گــوێی نەدەدایە ئەوە. پێیوابــوو نەخۆشــینێکی ســادەیە، بە گــاڵتەوە بە خــاڵۆی گــوت: "پێدەچی ببمە ماسی"!

ڕۆژ بە ڕۆژ وشکبوونی پێستی کامیران زیاتر دەبوو. قامکەکــانی وشــک دەبــوون، پێســتی هەردوو ڕانــی، گەردنی، پشـتی و سـمتی و تەنـانەت دەمودەزگاکەشـی. شـتی سـەیر ئەوە بـوو کە ئەو وشـکبوونە هـیچ ئازاری نەبوو.

کــــامیران زۆر حەزی دەکــــرد بنووســــێ، لــــێ قەت دەرفەتی دەسـت نەکەوت، هەسـتا چـی بە سـەر خـۆی و خێــزانەکەی هــاتبوو وەک چیــرۆک بــۆ تەبەشــیرە زەردەکەی گێــــڕایەوە. ئەو ڕازانەی لە خێــــزانەکەی

دەیشاردەوە بە تەبەشیرەکەی دەگوت، باسی سالانی شەڕی بۆ کرد، هەستەکانی خۆی و ئەو سەرقالییانەی سەرنجی ڕادەکێشا بۆ دەگێڕایەوە، باسی ئەو شەڕە شێتەی بۆ دەکرد، کە هۆش تێیدا ئاراستەی خۆی ون کردبوو.

****

لەو شەوە باراناوییەدا، کاتێک کەولاکەوڵ بوون تەواو بوو، دایکە لالەکەی نووستبوو و ئەو هەناسە ئارامەکانی دایکی دەبیست. بەلام براکەی کە دەست و سینگی سووتابوو، بەردەوام لە نێو نوێندا دەجوولا و لە ئازاردا دەینالاند. خالۆ عەلی تەمبوورڤان وەک هەموو جارێ هێشتا لە چادرێکی دوور لە لای هاوڕێیانی بوو.

ئەو و ئەم بەسەرهاتە سەیرەی تەنیا بوون ئەو شەوە. ئەو و ئەو کەولاوکەوڵبوونە سەیرەی لەش بە تەنیا بوون، هەروەها ئەو لەگەڵ ئەو چێژە خۆشە زۆرەی کە لە نووکی پەنجەیەوە تا تەوقی سەری دەگرتەوە، بە تەنیا بوون.

کامیران قەت بیری لەوە نەکردبووەوە کە دوایی چ دەبێ! خەمی ئەوەی نەدەخوارد کە خێزانەکەی بەو دۆخە بزانن. بیری لەوە نەدەکردەوە کە بەیانی دایکی دێت و شانی ڕادەوەشێنێ کە هەڵستێ و نانی بەیانی بخوا، بیری لە ئالانی برای نەدەکردەوە کە بێتە ژوور

سەری دانیشێ و داوای لێ بکا چاوی دەستە سووتاوەکەی بکاتەوە. هەر وەها بیری لە خاڵۆی نەدەکردەوە کە لەوانەیە هەر دەقەیەک بێتە نێو خێوەتەکە و لەعنەت لە شەڕ و تورکیا و پارتیش بکات.

ئیدی بیرکردنەوەی لەم شێوەی لا نەمابوو. ببووە تەبەشیرێکی قەڵەو و درێژی سەد و شەست سەنتیمی. گەلێک شت تێیدا گۆڕدرابوو. ئەو ببووە کەسێک لە جیهانێکی دیکەوە کە زەمانی فاکتەرە سروشتییەکانی دیکە نەیاندەتوانی کاریگەریی لێبکەن. پارچەیەک تەبەشیری مەزن کە بە ئارامی لە ژێر لێفەدا ڕاکشاوە و گوێ لە دەنگی دڵۆپی باران دەگرێ و کە چۆن بە توورەیی دەدەن بە سەر بانی خێوەتی سپیدا.

**یەکتر ناسین**

من کامیرانم، دەتوانی پێم بڵێی کامران، نەوەڵلا تۆ دەبێ پێم بڵێی کامران. وەها دروستترە. واتای ناوەکەیشم کەسێکی بەختەوەر و سەرکەتووە.

لەوانەیە تۆ من باش نەناسی. ئەوا دوو ساڵە تۆ لەگەڵ من دەژیت، بەڵام لەوانەیە نەمناسیت. مخابن من گەلێک ڕستەم بە تۆ نەنووسیوە. لەوانەیە یەک دوو ڕستەی بێسەروبەرم پێت نووسیبێ و هیچی دی. وەک: "بژی شۆڕش"، یان "خودا ئەرتەشی ئازاد بپارێزێ"، کە من ئەم دروشمانەم لەگەڵ هاوڕێیانی خوێندگا بەرلەوەی داعش بێ، دەگوتەوە. بیرم

ناکەوێتەوە کە دروشمی "گەل دەیهەوێ ڕژێم بڕووخێ"م بە تۆ نووسیبێ! ئەگەر ئەوەم بە تۆ بنووسیبا بە ڕاستیش ئەو نووسینە "سەری تۆی دەخوارد" و تۆی وەک کێری خەتەنەنەکراوی ئالانی برام کورت دەکردەوە.

ڕۆژێکی پاییز من تۆم لە دەبستان دزی. چاوم پێت کەوت و دیتم کە زۆر ناسک و باریکەلەیت و بریقەت دێ. تۆ وەک تەبەشیرە هەرزانەکان نەبووی. ئەوانە تەبەشیری حکوومەت بوون و ئەستوور بوون و زۆر تۆزیان دەکرد. خەتەکەشیان زوڵاڵ نەبوو، پیتێک دیار بوو و دە پیت ون دەبوو و وشەکە نەدەخوێنرایەوە. مامۆستایەک هەبوو، دواتر داعش ڕفاندی، زۆر ڕقی لەو تەبەشیرانە بوو و جنێوی پێدەدان. ڕۆژێکیان تەبەشیرەکەی دەستی لە پەنجەرەوە فڕێ دا و بە کۆخەکۆخ گوتی: شۆڕشێک لەم وڵاتە بەرپا بوو و دۆخەکە گۆڕدرا، بەڵام تەبەشیرەکان هەر وەک خۆیانن. دەبێ شۆڕشێک بەرپا ببێ بۆ ئەوەی ئەم تەبەشیرە نەفرەتیانەش لە ناو بچن. گۆڕانی تەبەشیرەکان بێگومان گۆڕانی خودی ڕژیمە، ئەو ڕژیمەی کە هەنووکە ناتوانێ تەبەشیرێکی باش دروست بکات، گەل دەیهەوێ تەبەشیر بتۆپێ.

دەی لەگەڵ من بیڵێنەوە: گەل دەیهەوێ ئەم تەبەشیرانە بتۆپن!

ئـێمە بە دوای ئەودا دروشــمـمان دەگــوتەوە، تــا کورســییەکانمان دەهەژا و لە پێکەنینــا لاڵ دەبــووین و مامۆستا لە مێزەکەی دەدا کە بێدەنگ بین.

هەر کاتێـــک مامۆســـتا دەیویســـت یەک لە ئـــێمە تەختەڕەش بسڕێتەوە یان خـۆی دەیسـڕییەوە! تـۆزی تەبەشیری سپی پۆلەکەی دەگرتەوە و لە ناچاری ئەگەر زستانیش با، هەموو پەنجەرەکانمان دەکردەوە. تۆزەکە دادەبـارییە سـەر سـەر و ڕیـش و سـمێڵی مامۆسـتا و وەک ئاشـەوانی لێدەهات. مامۆستا تۆزی سـەر سـەر و قـژی دادەتەکانـد و دەیگـوت: مـن بە نەخۆشـی ئاسـم دەمــرم. ئەم تەبەشـیرە لە گەردی گــوڵ و دووکەڵـــی کارگەکان زیاتر حەساسییەت دروست دەکات. نەفرەت لە ژیـانی ئـێمەی مامۆسـتا چ پـێش شـۆڕش و چ دوای شۆڕش.

ئەری تەبەشــــیرە جـــوانەکەم، ئــــاوا بــــوون ئەو تەبەشیرانەی حکوومەت دەیدایە مامۆستاکان. بەڵام تۆ! تۆ هێند جوان لە گۆشەی تەختەڕەش ڕاکشـابووی. دڵـی منت بردە سـەر خۆت. دەسـتم درێژ کـردەوە و بەپەلە تـۆم خسـتە گیرفـانم و لەگەڵ خـۆم بـردتمەوە مـاڵ. تـا ئێسـتاش نـازانم بـۆچی وام کـرد! شـتێکی نادیـار منـی بەرەو تــۆ ڕاکێشــا، بەڵام نــازانم چــی بــوو؟ لەوانەیە حەزکـردنم لە نووسـین بـێ، لەوانەیە ویسـتی مـن بـۆ دەربـڕین بـێ. بەڵام مـن تـۆم لەبیـر کـردووە، تـۆ لە

گۆشەیەکی ژوورەکەم لە منبەج بەجێ بووی بێ ئەوەی سەرنجی کەس ڕابکێشی.

ڕۆژ بەمجۆرە هاتن و چوون تا ئێمە لە منبەج کۆچمان کرد. دیسان هێزێکی نادیار منی بەرەو تۆ ڕاکێشا، تۆم لەگەڵ خۆم بردە حەڵەب، بەڵام دیسان لەبیرم کردی. تۆم لەبیر کرد چون دیوارێک نەبوو شتەکانی نێو مێشکمی لە سەر بنووسم. دیوارەکانی گەڕەکی ماڵی باپیرەم هەموو ڕووخابوون یان خەریک بوو دەڕووخان. دروست نەبوو لەبەر هەندێک دیواریش ڕاوەستین، نازانم بۆ. من خۆیشم لەبەر گوللەباران زۆر نەدەچوومە دەرەوە. گەلێک منداڵان لە کۆلانان کوژران، هەندێک بە دەستی نیشانەشکێنەکان ئەنگێوران، هەندێک لەژێر پەردووی وێرانەکاندا مردن، هەندێکیش وەک مەیسوونی خوشکم، کە ئێمە بە مەیسۆ بانگمان دەکرد، بە بومبارانی فڕۆکەکان مردن.

ئێمە پێمانوابوو مردن لە شەڕدا تەنیا پشکی سەرباز و شەڕڤانەکانە، بەڵام دواتر زانیمان کە ڕۆکێت و بۆمبا و گوللەی تفەنگە قووندەرە فرەوێژەکان، کوێریش.

لە منبەج تۆ هەر لە گیرفانمدا بووی و من لە دەرفەتێک دەگەڕام ڕستەیەک بنووسم کە دکتۆر فەرهادی باوکم بەردەوام دووبارەی دەکردەوە و من ئەزبەرم کردبوو: هەموو شۆڕشەکان لە یەک دەچن

کـامۆ. وەک چـۆن پشـکەڵ لە یەک دەچـن شۆڕشـیش وەهایە.

مـن ئەوەم ئەزبەر کردبـوو لـێ نەمـدەزانی مەبەسـتی بـاوکم چییە؟ بـاوکم لەپڕ ونبـوو. ئـێمە زۆر چـاوەڕێی گەڕانەوەی بووین. دایکم هەمـوو ئێواران لەگەڵ مەیسـۆ دەچـووە بەر پەنـجەرە و چـاوەڕێ دەمـا کە بگەڕێتەوە. بەڵام نەگەڕایەوە. بـــاپیرەم ئـــێمەی بـــردە حەڵەب. لەوێشـــەوە دوای ئەوەی مەیسـۆی خوشـکم کـوژرا، کۆچبەری عەفرین بووین و لە گونـدی شـەڕان جێگیـر بووین.

وادیارە ئیدی کاتی ئەوە هاتووە ئەو ڕستەیەی بـاوکم بنووسم. بەڵام لە سەر چی؟ لەسەر لەپی دەستم یان لە سەر سمتی پانی مەزییەت؟

بێگومان تۆ مەزییەتی جیرانمـان ناسـی تەبەشـیرەکەم، هـاوڕێ زەردە بـاریکەلەکەم. نـا. جـا چۆن تەبەشـیرێکی بێهەست، ژنێکی گوندیی بەختەڕەش و خۆش بناسێ؟

مەزییەت لە شەڕانی نزیک سنووری تورکیا جیرانمان بـوو. ئێسـتا باسـی نـاکەم بـا جـارێ بوەسـتێ. کە باسـی بکەم لیک بە لێوتدا دادەشۆڕێ و دەتوێیتەوە. ئەرێ ئـاو دەزێـتە دەمـت وەک دێـڵە سـەگێک. ئـاو دەزێـتە دەمـی سۆفی و پیاوچاکانیش کە باسی مەزییەت بکرێ.

بەهەرحـــاڵ هـــاوڕێ بـــاریکەلەکەم ئێســـتا نە کـــاتی باسـکردنی سـمتی مەزیـیەت و نە هـی بـۆنەکەیەتی، کە

تەنانەت جەندرمەی تورکانی لەوبەر سنووریشەوە گێژ دەکرد. پاشان باسی دەکەم، کاتێک من و تۆ تەنیا بووین و ئالانی برام، ئەو گووی کێچە، لێرە نەبوو.

لەوانەی پێت سەیر بێ و بەخۆت بڵێی: "خێرە ئەم کوڕە ئاوا لە خۆوە قسە دەکا! ماددەی سڕکەری کێشاوە؟"

بڕوا بکە تەنیا بۆنی تۆ هاتووەتە لووتم. بۆنی دیوارەکانی دەبستان و تەختەڕەشی پۆلەکەمان لە منبەج دێنەوە یادم. من تەنیا بۆنم بە تۆزە زەردەکەی تۆوە کردووە. مافی خۆتە کە لە بێدەنگییەکەم سەیرم بمێنی. بەڵام دەزانی بۆچی قسەم لەگەڵت نەدەکرد؟ من پێموابوو کە تەبەشیر هەستیان نییە و ناتوانن پێوەندی لەگەڵ مرۆڤ دروست بکەن. من تۆم نەدەناسی بۆیە خۆم بە تۆ نەدەناساند.

لێ شەڕ فێری کردم کە هەموو شت خاوەن هەستە، هاوڕێم. ئەو گوللانەی ئێسکی سەرباز و خەڵکی مەدەنیش کون دەکەن، هەستیارن هەر وەک ئەو قامکەی سەر پەلەپیتکەی چەک کە گوللە لە زیندانە بچووکەکەیان ئازاد دەکا. ئەرێ شەڕ فێری کردم هەموو شت خاوەن هەستە، لێ جگە لەوە، شەڕ فێری ئەوەشی کردم کە شتی هەرە بێنرخ و خراپ لای مرۆڤەکان لە کاتی شەڕدا خودی خۆیانن.

ئێستا نهێنییەکی بچووکی خۆم دەدرکێنم، زۆر گرنگ نییە، بەڵام دیسان پێت دەڵێم. وای دانێ من کوڕێکی گەنجم و لە ترسی سزادان لە خۆم مکور دێم.

ڕۆژێکیان تەبەشیرێکی سپیی هەرزانم خستە قوونی کوڕی ئەو مامۆستایەی کە جنێوی سەیری بە تەبەشیر دەدا. قەت حەزم بە کوڕی ئەو مامۆستایە نەکرد. باوکی، هاوڕێی ئەمیرێکی داعش بوو. ڕۆژێکیان ئێمە لەبەر تەختەڕەش ڕاوەستابووین و وێنەی تانک و کۆپتەرمان دەکێشا، ئەو کوڕە قووندەرە بە منی گوت:

- باوکی تۆ بریندارەکانی ئەرتەشی ئازاد دەرمان دەکا. باوکت سەحواتە[1].
- سەحوات!؟

من بە توورەیی لێم پرسی. یەکەمجار بوو ئەو وشە سەیرەم دەبیست؛ سەحوات! بەڵام سەرەڕای ئەوە دەمزانی کە جنێوە. دواتر تێگەیشتم کە هەر کەسێک دژی داعش بێ پێی دەڵێن سەحوات. بە ڕقەوە بۆی چووم و قیڕاندم:

- هەی کوڕی قەحبە، باوکی من سەحواتە؟

---

[1] ئەم ناوە سەرەتا لە عێراق بەکار هێنرا. ئەو هێزانەی عەشرەتە عەرەبەکان کە بەرەنگاری ئەلقاعیدە بوونەوە، ئەم ناوەیان لە خۆیان نابوو. واتای ناوەکە وشیاری و هێزی وشیار بووە. پاشان بوو بە ناوێکی نەرێنی کە ئەلقاعیدە، ئەلنوسرە و داعش لە دوژمنانی خۆیان دەنا.

قورگیم گرت. شاگرد هەموو چاویان زیت کردەوە و سەیری ئێمەیان دەکرد. کوڕەکەی مامۆستا پێژامەیەکی شینی ئادیداسی لە پێ بوو. دەستم برد و دەرپێکەیم داکەند. قوونە ڕەش و نەرمەکەی بە ڕووتی دەرکەوت. ئەو کوڕی کەرە پشتی کردە تەختەڕەش بۆ ئەوەی قوونی لە تیری نیگای شاگردەکان، بپارێزێ، بەڵام من بە توندی کێشامە بەر سینگی خۆم و هەڵمگەڕاندەوە و قوونیم کردە شاگردەکان کە ببینن.

منداڵ دایان لە چەپڵە و قیڕاندیان و بە مێزەکە تەپڵیان لێدا. پاشان بوونە دوو بەش، لایەک هانی منیان دەدا و لاکەی دیکەش بوونە هاندەری کوڕی مامۆستا.

"هەی بکوتمە شەجەرەنامە خێزانەکەت".

من ئەم جنێوەم پێدا کە لە خاڵۆ عەلی تەمبوورڤانەوە فێر ببووم و دەستم ڕاکێشا بۆ تەبەشیرێکی بۆزی ئەستوور کە وەک قامکی پیاوێکی قەڵەو وابوو. ئەو تەبەشیرە لەو شوێنە بوو کە تۆش هەر لەوێ بووی. لەپڕ ڕامانێک کەوتە مێشکم: "بۆچی ئەو تەبەشیرە پیسە نەخەمە قوونە پیسەکەیەوە؟!"

زیاتر لە چرکەونیوێک بیرم نەکردەوە. هەوڵم دا تەبەشیرەکەی بخەمە قوونیەوە. ترسنۆک! قوونی توند قووچاندبوو وەک ئەوەی ڕێگە لە کێرێک بگرێ. بەڵام من خێرا کەلەکەیم ختووکە دا و قوونی شل بووەوە،

تەبەشیرەکەم خستە نێوان هەردوو گوڵمەی قوونی. وازم لێنەهێنا بە دوایدا چووم بزانم چ دەکا!

ئێستا تۆ لەم قسەپیسییەی من سەیر دەمێنی نا؟ من وەهام. کامیرانی فرەوێژ و زمان پیس و بێنەزاکەت. من نەخۆشیی فرەوێژیم گرتبوو و هەر قسەم دەکرد، وەک ئەوەی تووشی زگچوونی دەم بووبم. دایکم بەرلەوەی لاڵ ببێ وەهای دەگوت. من دەتوانم حەفتەیەکی ڕەبەق باسی هەر شتێک بکەم. من دەتوانم تەنانەت باسی هیچیش بکەم. هەندێک جار خۆیشم لە خۆم سەیر دەمێنم. هەندێک ژن هەبوو کاتێک دەهاتنە سەردانی دایکم، لێم عاجز دەبوون. من لە ناویاندا دادەنیشتم و بۆ خۆم سەیرم دەکردن. هەر کە قاوەیەکەیان دەخواردەوە یەکیان فنجانی هەڵدەگرت کە فاڵ بگرێتەوە، منیش دەستم پێدەکرد و شتی سەیرم دەگوت. ئەوان پێدەکەنین و لە خەیاڵەکانی من سەیر دەمان، لە تاقەتی من بۆ قسەکردن سەیر دەمان. من بێبڕانەوە قسەم دەکرد وەک ئەوەی ڕستەی نووسراوی سەر تەختەڕەش بخوێنمەوە. دایکم دەڵێ هێشتا لە زگیدا بووم، دەستم بە قسەکردن کرد:

- وەڵاهی کامۆ هێشتا لە زگمدا بووی دەنگت هاتە گوێم. هەشت مانگان بووی لە زگمدا گوتت ماما!

دەی با واز لە قسەکانی دایکم بێنین، کە جێ بڕوا نین. با بگەڕێینەوە سەر تەبەشیری بۆزی ئەستوور. دوای ئەوەی خستمە نێو هەردوو گوڵمە قوونی کوڕەکە، وەک جگەرەی دەمی سیگارکێشێکی گووپقەڵەوی لێهات. ئەو سەگە لە پۆلەکە چووە دەر و منیش لە بەر تەختەڕەش مامەوە. خۆم وەک تاوسێک فش کردەوە. شاگردەکان چەپڵەیان بۆ لێدام. چوومە دەرەوە و لە دەبستان هەڵهاتم. دەنگی شاگردەکان بە دوامدا وەک ئاهەنگی دروشمێک هەر بەرز دەبووەوە: کامی ران، کامی ران، کامی ران.

نازانم دواتر چی بوو. گەلۆ ئەو تەبەشیرە هەر لەو شوێنەدا مایەوە کە تێمخست؟ هاتە دەر؟ کێ دەریهێنا؟ تەبەشیر ئێشی پێگەیاند؟ ڕۆژی دواتر بە چ ڕوویەکەوە هاتەوە دەبستان؟ باوکە داعشییەکەی چی گوت؟ گەلۆ شاگردەکانیان سزا دا کە بۆچی نەچووبوون بە هاواری هاوڕێکەیانەوە؟ چ سزایەکیان دان؟ بڵێی دەستیان گرتبێ بە سەر ماڵی ئێمەدا وەک ئەوەی داعش هەمیشە هەڕەشەی لێدەکردین؟

لە بەختی باشمەوە هەر ئەو ڕۆژە باپیرم لە حەڵەبەوە هاتبوو و من و دایکم و ئالان و مەیسۆی بچووکی لە منبەج بردە دەرەوە.

دەڵێی باسی حەڵەبیشت بۆ بکەم! باشە با دەرفەتێکی ترمان هەبێ جا. لەوانەشە باسی نەکەم. تۆ خۆت لە

حەڵەب لەگەڵم بووی. تۆ قەت لە من دانەبڕای تا ئەو کاتەی کۆچمان کرد بۆ شەڕان و لەوێشە چووینە عەفرین و لە عەفرینیشەوە هەڵاتین هاتینە ئەم کەمپە گووە.

# نامەی باوکی ڕفێندراوم

مانگێک دوای ئەوەی ڕفاندیان یەکەم نامەی باوکم هات. نامەکە تەنیا چەند ڕستەی کورت بوو، من بۆ دایکمم خوێندەوە:

"سلاو لەیلا، چۆنی؟ منداڵەکان چۆنن؟ من باشم و وەک خووی پێشووم کاری نەشتەرگەری و شکستەبەستن دەکەم. لە هیچ کەمم نییە، جگە لە دیتنی ئێوە و دانیشتن لەگەڵتان نەبێ. بەدوای من مەکەون، من بەردەوام نامەتان بۆ دەنووسم و باسی خۆمتان بۆ دەکەم. لەوانەیە لەم دوو مانگەدا بگەڕێمەوە بۆ لاتان. ئاگات لە منداڵەکان بێ، بەتایبەت لە پەرییەکەم؛ مەیسۆ".

من ئەو نامەم بە دەستی خۆم نووسیبوو. کاتێک بۆ دایکمم دەخوێندەوە دەنگم دەلەرزی. دایکم هەرچەندە خۆی دەرچووی بەشی وێژەی ئینگلیزیی زانکۆی حەڵەبە، بەڵام من نەمهێشت خۆی نامەکە بخوێنێتەوە. ویستم خۆم بۆی بخوێنمەوە لە ڕوخساری بڕوانم بزانم بە خوێندنەوەی هەر ڕستەیەک چ گۆڕانێک لە ڕوخساریدا ڕوو دەدا!

نامەکەم لە کتێبێکی باوکم کە کتێبی نامەنووسین بوو، کۆپی کردبوو. تەنیا هەندێک گۆڕانی بچووکم تێدا کرد و لە کۆتاییەکەیدا مۆری دکتۆرییەکەی باوکمم لێدا. مۆرەکەشم لە کلینیکەکەی (عیادە) باوکم کە نزیکی نەخۆشخانە بوو دزیبوو. لای خۆم گوتم ئەوە بەڵگەیەکی باشە کە نامەکە بەڕاستی لە لای باوکمەوە هاتووە. دوای ئەوەی نامەکەم نووسی و بۆ دایکمم خوێندەوە، هەستم بە ئاسوودەییەکی سەیر کرد وەک ئەوەی بەڕاستی باوکم نامەکەی ناردبێ.

- کێ ئەم نامەی پێدای؟

کاتێک خوێندنەوەی نامەکە تەواو بوو دایکم ئەمەی پرسی. من بۆ ئەم پرسیارە ئامادە نەبووم و قەت بیرم لێ نەکردبووەوە. هەندێک تێکچووم بەڵام لە دواییدا وەڵامم دایەوە:

- کەسێکی ئاسایشی داعش؟
- جا لە کەیەوە ئاسایشی ئەوان بوونەتە پۆستەچی؟ ئادەی نامەکەم بدەیە.

بە دەستێکی لەرزۆک نامەکەم دایە دایکم. لە ترسی ئەوەی ڕاستییەکەی ئاشکرا بێ دڵم کەوتە ترپەترپ.

دایکم نامەکەی هەڵگێڕایەوە، خوێندیەوە و دواتر پێچایەوە و گوتی:

- خەتەکەی زۆر لە هی باوکت ناچێ، ئەگەر ئەو مۆرەی پێوەنەبا، قەت باوەڕم نەدەکرد خۆی

نووسـیبێتی. بـا خەتەکە لەگەڵ خەتەکـانی نێـو دەفتەرەکـانی زانکـۆ بەراوەد بـکەم. بەس پـێم نـاڵێی بـۆچی باوکـت مـۆرەکەی لەگەڵ خـۆی بردووە؟

***

پاش کەمێک دایکم هات سەری ماچ کردم و گوتی:

- فەرقێکـی وای نیـیە، لەوانەیە نـامەکەی بەپەلە نووسیبێ!
- جا چۆن دەبێ، بێگومان بەپەلە نووسیویەتی.

دایکم بزەیەکی کرد و گەشایەوە.

لە دوای ڕفانـدنی بـاوکم ئەوە یەکەمجـار بـوو بـزەی شیرینی دایکم ببینم.

***

بزە شیرینەکەی دایکم ڕێگەی بۆ کردمەوە درێژەی بە یـارییەکەم بـدەم. هەر دوو حەفـتە جارێـک کـورتە نـامەیەکی وەک ئەوەکەی پێشـووم دەنووسـی. کورتەنامەیەک کە هیچ چەشنە زانیارییەکی تێدا نەبوو، نە هەستی ژن و مێردایەتی کە مـن نـازانم چۆنچۆنییە، نە خۆشەویسـتیش. تەنیـا چەنـد ڕسـتە بـوو؛ سـەلام و کەلام و پرسی وەزعی منداڵەکان و بەڵێنی گەڕانەوە بە زووترین کات.

کە نامەکـان چەنـد پـاتە بـوونەوە، ئیـدی دایکـم زۆر گوێی نەدەدایە نامە. ئەو زۆر خەمگین ببوو. کەم قسەی

دەکرد و ئێمەی لە ناو ماڵەکەدا وەک زیندانی لێکردبوو. دەرگای دادەخست و پەردەی بەردەدایەوە. تەنانەت بە ڕۆژیش پەردەکان هەر داخرابوون. ئێمەی لە گورگ و کەمتیار دەترساند. دەیگوت بە کۆڵانەکانی منبەجدا دەگەڕن، باوک و منداڵ دەڕفێنن.

ئێمە لەو زیندانەی دایکم بۆی دروست کردبووین، بێزار ببووین. من و ئالان ئیدی ماڵەوەمان کردە گۆڕەپانی یاری. لە سەر کەنەپەکان هەڵماندەخستەوە و سەمامان دەکرد و لە سەر نوێن و قاڵییە تورکییەکانی نێو ساڵۆن سەرمەوقولانجمان دەدا. چاوشارەکێمان دەکرد، دەمانکردە قیژ و واژ و بووکە شووشەکانی مەیسۆمان دەگرتە یەکتر. پێڵاو و گۆرەویمان وەک تۆپ لێدەکرد و لە یەکترمان دەگرت. چی تەشقەڵە هەبوو ئێمە دەمانکرد و دایکم نوقمی بن گۆلی دەرد و ئازاری خۆی بوو. جگە لە مەیسۆ کەسی لەم دونیایەدا نەمابوو. مەیسۆش زۆرجاران دەگریا. دەچووە بەر پەنجەرە یان دەرگای داخراو و بانگی دەکرد: بابە، بابە! تا ماندوو دەبوو و دەگەڕایەوە نێو بووکە شووشەکانی.

لەگەل ئەو هەموو یاری و تەشقەڵەش، دیسان دەمانویست دڵی دایکمان خۆش بکەین و دەرد و ئازاری لێ دوور بخەینەوە. ئێمە لاسایی حەیوانەکانمان دەکردەوە، من لاسایی ژنانی گوندم دەکردەوە کە چۆن دەهاتنە کلینیکەکەی باوکم و چۆن قسەیان دەکرد. لە

سەرەتاوە دایکم زۆر پێدەکەنی، بەڵام دواتر پێکەنینی بیر چووەوە. بەردەوام بێدەنگ بوو و سەیری شوێنێکی نادیاری دەکرد.

ڕۆژێک دەنگی تەقەی دەرگای ماڵ هات. من و ئالان وەک هەموو جارێ هەڵهاتین کە دەرگا بکەینەوە. بەڵام دەرگا قوفڵ کرابوو. دەنگی مام نیهادم لە پشت دەرگاوە هات:

- دەرگاکە بکەنەوە منم مام نیهاد.

من بە خۆشحاڵییەوە بانگم کرد:

- سڵاو مامە. دایکم دەرگاکەی لە ناوەوە قوفڵ کردووە. کلیلەکەی بە خۆیەتی.

دایکم دەنگی قەرەباڵغیی بیست و بە ڕوخسارێکی ترساوەوە لە لای مەتبەخەوە هات. بە دەست لێی پرسین ئەوە کێیە لە دەرگا دەدا، ئێمەش گوتمان مام نیهادە. دایکم دەستی برد بۆ سەرپۆشە ساتەنە هەڵواسراوەکەی، دای بە سەریدا و لە پشت دەرگا ڕاوەستا و گوتی:

- مەرحەبا نیهاد، چ باسە؟

- دایکی کامیران خێرە. هەواڵێک لە دوکتورەوە هاتووە. ئەو لە زیندانی منبەجە، بەڵام باشە. لەوانەیە هەندێک لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن، بەڵام بەری دەدەن و دەگەڕێتەوە لاتان. ویستم ئەم هەواڵەتان پێ بگەیەنم.

- ئێ زۆر باشە، مزگێنیی خێرت بێ.

دایکم بە کەیفەوە وەهای گوت و ویستی بگەڕێتەوە سەر کارەکەی، لێ من و ئالان داوێنیمان گرت و داوامان لێکرد بهێڵێ لەگەڵ مام نیهاد بچینە ماڵی داپیرەمان. مامەم هێشتا لە پشت دەرگا بوو و دەنگی ئێمەی بیست. ئەویش ڕجای لە دایکمان کرد کە بهێڵێ بچین و بەڵێنی دا ئێوارە بمانگەڕێنێتەوە.

دایکم قەبووڵی کرد بەڵام بەو شەرتەی بەرلە ڕۆژئاوابوون بمانگەڕێنێتەوە و گوتی:

- دوای ڕۆژئاوا من دەرگا بۆ کەس ناکەمەوە. باوکی کامیرانیش بێتە بەر دەرگا بۆی ناکەمەوە.

***

لە ڕێدا من و ئالان لە خۆشحاڵیی هەواڵی سەلامەتیی باوکمان نەماندەزانی چ بکەین! بە هەڵهاتن دەکەوتینە پێش مامانمان و دیسان دەگەڕاینەوە بۆ لای.

باوکمان لە منبەجە! من لە دڵی خۆمدا وەهام گوت و بڕیارم دا کە ناوەڕۆکی نامەکانی بگۆڕم. بێگومان ئەشکەنجە دراوە. دەبێ لە نامەکاندا باسی ئەشکەنجە بکەم و بڵێم داعش چی بەسەر هێناوە.

- بەڵام شتی لەوە گرنگتریش هەیە.

وەهام گوت و وەڵامی خۆیشم دایەوە:

- دەبێ لە ڕێگەیەک بگەڕم کە باوکم لە زیندان ڕزگار بکەم.

شێوازەکانی ڕزگارکردنی باوکم هاتە پێش چاوم. بێدەنگ لەپاڵ مامم ڕۆیشتم و تەماشای ئەو ئۆتۆمبیلانەم کرد کە بە جادەکەدا دەهاتن و دەچوون، تا گەیشتینە ماڵی باپیرەم. دوای دوو سەعات کاتێک بەو ڕێگە درێژەدا گەڕاینەوە ماڵێ، شێوازەکانی ڕزگارکردنی باوکم هەر لە مێشکمدا بوو.

***

*بیسمیللاهیرەحمانیرەحیم*

*لەیلاکەم،*

*ئەم نامەیە لە زیندانەوە دەنووسم. من لێتان دوور نیم، بەردەوام لە مێشک و دڵی مندان. ئەلحەمدولیللا بەم نزیکانە لە زیندان دێمە دەر. من بە تۆمەتی پشتیوانیی لە ئەرتەشی ئازاد دەستبەسەر کراوم. دوای حەفتەیەکی دی بەرم دەدەن.*

*فەرهاد*

وەک هەموو جاران مۆرەکەی باوکمم دا لە ژێر نامەکە. کاتێک نامەکەم دایە دەستی دایکم، پێمگوت:

- کەسێک لە ...
- ئاسایشی داعش نامەکەی هێنا.

دایکم ڕستەکەی تەواو کرد و بە دەنگێکی لەرزۆک و خەمگین گوتی:

- کـامۆ بە قوربـان! تـۆ پێتـوایە دایکـت ئەوەنـدە سادە و نەزانە! لە یەکەم ڕۆژەوە دەمزانی ئەو نامـانەی دەیدەیە مـن سـاختەن، مـن دەزانـم تـۆ دەیاننووسـی کـوڕم. تـۆ دەتەوەێ مـن دڵخـۆش بکەی و سێبووریم بەیتێ. مـن هـیچم نەدەگوت چون بە هیوای هەواڵێکی باوکت بووم. ئیدی هەرچی بێ مـن بڕوای پێدەکەم. ڕاسـت بـێ و درۆ بــێ هەر هەواڵێــک بڵــێ ســاخە بــڕوای پێدەکەم. کامۆکەم، دڵـم شـتی دیکەم پـێ دەڵـێ، دڵیش قەت درۆ ناکا.

و دایکم گریا.

ئێمە هەرسێکمان وەک بەچکەپ شیلە لە دەوری کۆ بووینەوە و بێدەنگ ماین.

جـا تـۆ چـووزانی تەبەشـیرە زەردەکەم کە ئـازاری ئەوەی کەسێکی لێ ڕفێندرابێ، چەندە زۆرە؟ باسـی ئەو ئازارە لە من بپرسە. لە هیچ ئازارێکی دی ناچێ. ئێش و ئـازارێکی هێنـد غەددارە لە تیرێـک دەچـێ دڵـی کـون کردبـێ و برینـدار بە هیـوای کەسـێک بـێ کە بێـت و تیرەکە دەرکێشێ و برینەکەی دەرمـان بکـا. یـان مردنـی کەسێکی بریندار ڕابگەیەنرێ.

## ئەو نهێنییەی لە هەموو کەسی دەشارمەوە

خۆر هەڵهات.

چ درۆیەکە! خۆر چۆن دەتوانێ هەڵبێ و ئاسمان لە ژێر هەوراندا بێ؟ باشتر وایە بڵێم ڕۆژ بووەوە. لە هەردووشیان باشتر ئەمەیە: لە خەو هەستام.

بەیانیت باش تەبەشیرە زەردەکەم. دەی با پێش هەموو شت ناوێکت لێ بنێم. هەموو شت ناوێکی هەیە. خەڵک سەگەکانیان ناو دەنێن، ناو لە پشیلە و حەیوانە ماڵییەکانی دیکەشیان دەکەن. خەڵکی سەردەمی کۆن ناویان لە چەم و بیابان و ئەستێرەش کردووە. با ناوێکت لێ بنێم کە هەموو جار نەڵێم تەبەشیری زەرد. ناوت دەنێم زەرێ. ناوێکە لێت دێ. تۆی زەرد، زەرێی هاوڕێم.

ئەمڕۆ نهێنییەکی خۆمت بۆ باس دەکەم. نهێنییەک کە ئەوا دوو ساڵە لە هەموو کەسی دەشارمەوە. بەڵام تەنیا بە تۆی دەڵێم. تۆ ئیدی هاوڕازی منی. هەرچەندە شەرمیش دەکەم، بەڵام بە تۆی دەڵێم.

من میز بە خۆمدا دەکەم.

هەموو شەوێ.

ئەرێ زەرێ، من هەموو شەوێ بە خۆمدا دەمیزم.

بەڵام تا ئێستاش نەمهێشتووە کەس بزانێ وەهام. نە دایکم و نە کەسی دیکە و نە تۆش. جیرانە قوونزلەکەشمان واتا مەزییەتیش نەیدەزانی. لەوانەیە پرسیارێک بێتە مێشکت و بڵێی: جا چۆن ئەو کامیرانە شوومە توانیویەتی ئەو ماوە درێژە نهێنییەکەی لە هەموو کەس بشارێتەوە؟ ئەو هەمووە میزەی بە خۆیدا دەکا، بۆ کوێ دەچێ؟

مافی خۆتە هاوڕێ. ئەوەش ڕازێکە بۆت باس دەکەم.

من پێش خەوتن داێبی دەبەستم.

ئەرێ زەرێ گیان.

من داێبی لەخۆ دەکەم بۆ ئەوەی میزەکەم هیچ کوێ تەڕ نەکا. هەر خۆیشم داێبییەکان ئامادە دەکەم.

من قوماش، فانیلە پەموو، سپۆنج و شتی دیم کۆ دەکردەوە و بەکارم دێنا. ڕۆژێک جاوێکی پەمووییی سەوزم بە دار زەیتوونێکەوە دیت. بۆنێکی گەنیوی لێدەهات. لەوانەی بۆنی ڕشانەوەی پشیلەیەک یان بۆنی گووی چەکدارێکی ماندوو لە شەڕ بێ. بەهەرحاڵ ئەو جاوە وشک ببووەوە و هەر ئەوەش بۆ من گرنگ بوو. بە توندی لە نێو لقەکانەوە ڕامکێشا و پێچامەوە و خستمە ژێر باخەڵەم و ڕۆیشتم.

که شەو داهات، پارچەیەک لە جاوە سەوزەکەم بڕی و لە نێو ڕانی خۆم پێچاا و کیسەیەکی نایلۆنیشم تێوەپێچاو کە هیچی لێ نەیەتە دەر. دیارە کە خەوتم پڕم کرد لە میز. ئەرێ. لە سایەی ئەو داییبیانەوە ئیدی خەمی ئەوەم نەما کە میز بە خۆمدا بکەم یان نا.

بەیانی نزیکەی سەعات شەش لە خەو هەستام و داییبیم لە خۆم داماڵی و چووم فڕێم دا بێ ئەوەی کەس پێم بزانێ. دوو ساڵی ڕەبەق حاڵم ئاوا بوو زەرێی هێژا.

***

سەرەتا داییبیەکانی مەیسۆی خوشکمم دەدزی. زۆر بچووک بوون بەڵام لە خۆم دەکرد. هەندێک میزی دەدالاند، بەڵام چاری دەهات.

پاشان کۆپتەرێک پێش لەوەی ئێمە لە حەڵەب دەرکەوین، خوشکەکەمی کوشت. من بێئەوەی دایکم بزانێ دەچووم داییبیم بۆ خۆم دەکڕی. هەموو بچووک بوون و بۆ من نەدەبوون. دەچوومە دووکانەکان و دەمگوت برایەکی شیرەخۆرەم هەیە بۆ ئەوی دەبەم. ڕۆژێک دووکاندارێکی حەڵەبی گوتی: "ئەو داییبیانەی تۆ دەیبەی بۆ منداڵی دوو سێ ساڵانە، مەگەر برا شیرەخۆرەکەت چەند مانگانە؟" لە دواییدا تووشی دووکانێک هاتم لە نزیکی خۆمان کە داییبی "منداڵی گەورە"ی دەفرۆشت. کاتێک ڕیکلامەکەیم خوێندەوە،

سەیر مام. دایبییەکان بۆ منداڵی تا دەساڵان دەبوو. تێگەیشتم کە تەنیا من میز بە خۆمدا ناکەم و گەلێک هەڤاڵم هەیە. ئەوەش دڵخۆشییەک بوو بۆ من.

"دیاردەی ئەو منداڵانەی بە خۆیاندا دەمیزن، دوای شەڕ یەکجار زۆر بووە". ڕۆژێک ئەم ڕستەیەم لە دەمی دوکتورێکەوە بیست. دوکتورەکە لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ ڕۆژنامەوانێکی وەک مەزییەتی مەمک مەزن و مەکیاج زەق، قسەی دەکرد.

زەرێکەم! جا تۆ چووزانی ئەم بابەتە چۆنە؟ مەبەستم ئەوەیە مرۆڤ چۆن لە خەودا بە خۆیدا دەمیزێ؟

بێگومان تۆ نازانی! دەی جا گوێ بگرە! جا کەی تەبەشیر بە خۆیاندا دەمیزن کە بزانن مرۆڤ چۆن بە خۆیدا دەمیزێ؟ بەڵام تۆ بە خۆتدا دەمیزی. میزی تۆش ئەو نووسراوانەیە کە لە دوای خۆت جێی دەهێڵی، نووسراوی سەر تەختەڕەش، دیواری ڕووخاو، بەرمیلی مردن، قاپووری ڕۆکێتەکان کە خەڵک لەبەر دەرگای خۆیان دایدەنێن و گوڵی تێدا دەچێنن.

ئێستا لەگەڵ ئەو ڕستەیەی باوکم کە دەڵێ: "شۆڕش وەک پشکەڵ وان لە یەک دەچن"، دەمەوێ ڕستەیەکی دیکەش بنووسم. ئەوا چوار ساڵە لە گوێمدا دەزرینگێتەوە و من دەمەوێ لە سەر تانک و تۆپێک بینووسم: "هەی لە شەڕ نیم". ئەرێ ئەگەر لە دەستم بێ ئەمە لە سەر هەور و ساجی خۆریش دەنووسم.، لە

سەر ڕەگی دار و پۆستاڵی سەربازان و کڵاوە ئاسنەکانیشیان. ئەری، هەی لە شەڕ نیم. من لەو شەڕە نیم کە شیری ئاویکی خراپی خستووەتە نیو لنگی من کە ئاوەکەی ڕاناوەستی و بەردەوام دڵۆپە دەکا. من لەم شەڕە نیم کە مەیسۆی خوشکمی وەک پسکیتیک کردە دوو لەت. من لەم شەڕە نیم کە ماڵی من، ماڵی باوکم، ئارامی و ئاسایشی من، دەبستانەکەم و باسکیلە سەوزەکەشمی لی ستاند.

من لەم شەڕە نیم کە لە کۆچبەریی عەفریندا تریلی تەراکتۆریکی کردبووە ماڵی ئیمە لە نیو باخە زەیتوونەکاندا. من لە شەڕ نیم کە هیشتی گورگ و کەمتیار هیرش بکەنە سەر عەفرین، دوا ئارامگەمان، و خەو و ئارامییەکەمان بدزن. من لەو شەڕە نیم کە کەس نازانی کی ئاگرەکەی کردەوە و کی دەیکوژینیتەوە و چۆن؟

هیندەی نەمابوو باسی شیوەی میزکردن بە خۆمدا بکەم بۆت، لی کەوتم بە کۆی باسی شەڕدا. مەگەر نا؟ بابەتەکە پیوەندی بەوەوە نییە کە کەسیک زۆر ئاو دەخواتەوە یان کەم. نا. بابەتەکە پیوەندی بە زۆر خواردنەوەوە نییە. بابەتەکە ئاوا دەست پیدەکا: سەرەتا خەویکی خۆش دەبینم. دواتر دەبیتە ڕەشەخەون. میزەڵانم تژی و قورسە. وەک ئەوەی سەتڵیک پڕ بی لە ئاو و دەبی بەتاڵ ببی. میزم دی. لە شوینیک دەگەڕیم

کە بمیزم، ئاودەستێکی گشتی، چۆڵەوانییەک، بنداریکی دووره ڕێ، دیوارێکی شاراوە، لۆرییەک لە کۆلانێکی چۆڵ و هۆڵ، یان هەر جێیەک بێ کە کەس نەمبینێ. دواتر سەیر دەکەم لە قوژبنێکی تاریکم بە تاقی تەنیا. بە پێوە ڕادەوەستم، شێرەکەی نێو لنگم دێنمە دەر و تا ئاخر دەیکەمەوە:

- شرڕڕڕڕڕڕ. شرڕڕڕڕڕڕ.

چەند چرکە تێناپەڕێ هەست بە ئاسوودەییەکی سەیر دەکەم، پشت لەو شوێنە هەڵدەکەم و ...

لە خەو هەڵدەستم.

بە نەفرەت بێ.

دیسان کردم بە خۆمدا.

دەی قەیناکە کوڕە، بە خۆم دەڵێم هەستە دایبییە پڕ لە میزەکەت بکەوە و خێرا بڕۆ فڕێی دە بەر لەوەی دایکت لە خەو هەستێت و پێت بزانێ.

***

ئەو چیرۆکە بە ژانەوە دەستی پێکرد زەرێی دەلال، ئەو ڕۆژەی داعش دوای ڕفاندنی باوکم هێرشی هێنایە سەر ماڵی ئێمە لە منبەج. تێریان نەخوارد باوکمیان لە نەخۆشخانەوە ڕفاند، هێرشیان کردە سەر ئێمە و ویستیان بە زۆر ئێمەش لە ماڵ دەرکەن. من لە ڕیشی ئەوان ترسام. لە دەرپێکانیان ترسام ئەو کاتە بیرم لەوە کردەوە کە چۆن کێریان لەو ژێرەوە وەک لووتی قەلی

تـووره شـۆڕ بـووەتەوە. لە نیگـا بە سـامەکانیان، لە ئـاهەنگی قسـەکردنیان کە لە هـی مرۆڤـان نەدەچـوو، ترسام.

ئەوان هەڕەشـەیان لە دایکـم کـرد و گوتیـان کە دوای دوو ڕۆژی دیکە دێنەوە و دەست بە سـەر ماڵەکەماندا دەگـرن و وەک دێـڵە گـورگ بە قـژ ڕایدەکێشـن. پێشـیانگوتن کە بەچکەکانی، مەبەسـتیان ئێمە بـوو، لـێ دەسـتێنن گەر مـاڵەکە چـۆڵ نەکـا. ئـێمە خۆمـان لە گۆشەیەکی ساڵۆنەکە شاردبووەوە و لە ترسان بێدەنگ ببووین. دواتـر ئەو پیـاوانەی خـودا و دەوڵەتـی ئیسـلام ڕۆیشـتن و مـن وامزانـی کێریـان بە ڕیتمێـک وەک سروودی شەڕ بە ڕاست و چەپدا دەشەکێتەوە.

ئەو ڕۆژە مـن ترسـام. زۆر ترسـام. ترسـەکەم ئەو ڕۆژەم بێسنوور بوو و ناتوانم باسی بکەم.

شەو لە خەودا گورگێکیم دیت، گورگێک لە دەشـتێکی پـان و بەریـن کە بە بەفـر داپۆشـرابوو. مـن لە تـرس و سەرمادا دەلەزیم و لاقم لە بەفرەکە دەچەقی. گورگەکە بە دوامەوە بـوو، دەشـتی بەفـریش لە پێشـمەوە و ئەژنۆکـانم سسـت ببـوون و نەیانـدەتوانی مـن هەڵگـرن. لەپڕ گەرمایەک کەوتە ڕانەکانم. گەرما تا بن ڕانم چوو. کاتێک گورگەکە بە دوامەوە بوو، ون بوو و من هەستم بە ئاسوودەییەکی مەزن کرد.

بە دەنگی دایکم بەخەبەر هاتم، بانگی دەکردم:

- کامۆ، کامۆ! هەستە بچۆ هەندێک گۆشت و سەوزەمان بۆ بکڕە.

لە خەو هەستام.

بە تەڕایی نێو نوێنەکەم شڵەژام. لە ژێر نوێنەوە دەستم بۆ دەرپێکەم برد. تەڕ بوو. تێگەیشت لە خەودا میزم بە خۆمدا کردووە. بە دایکمم گوت:

- باشە دایکە. ئێستا هەڵدەستم.

بەڵام ئەو وازی لێنەدەهێنام. بەرەو مـن هات تا گەیشتە سەر نوێنەکام و لێفەکەی لە سەرد لادام.

تا ئێستاش نازانم دایکم چۆن تێگەیشت من میزم بە خۆمدا کردووە؟ لەوانەیە هی بۆنە تیژەکەی بێ. لەوانەشە هی تەڕییەکەی بێ! وەک ئەوەی چاوی بە مارێک کەوتبێ، قیڕاندی:

- هەی حەیوااااااان.

و دەستی کرد بە لێدانم.

دە سەیرکە توخوا زەرێ!

جا تۆ شتی وات بە مێشکدا دێ کە بەیانی لە خەو هەڵدەستی و شەپلاخەی تیژ بە دوای یەکدا لە ڕوخسارت بکەوێ و جنێوت پێ بدرێ!

ئاخ هاوڕێ ئاخخخ. خۆزگە منیش تەبەشیرێک وەک تۆ بام. بڕوا بکە قەت بە خەمم نەدەکرد گەر تا ڕۆژی قیامەت وەک جگەرەیەکی دانەییساو لە قوونی کوڕی مامۆستا داعشییەکەدا بام. بێگومان ئەوە بۆ من لە

میزکردن بە نوین و شەپلاخەکانی دایکم زۆر باشتر دەبوو.

بیرم ناکەویتە ئەو بەیانییە چۆن لە خەو هەستام و لە نیو نوین هاتمە دەر. بیرم ناکەویتەوە بە چ ڕوویەکەوە سەیری دایکمم کرد؟ بیگومان من بە ڕوویەکی تیرشەپلاخە و دەرپییەکی تیرمیزکراو لە پیشی ڕاوەستام. شەرمم لە خۆم، ڕقم لە خۆم و دایکم لەو بەیانییەدا بیسنوور بوو.

ڕۆژی دواتر دیسان هەمان شت دووبارە بووەوە. شەپلاخە و جنیو دووبارە بووەوە، شەرم و ڕقیش دووبارە بووەوە.

ڕۆژی سییەمیش دیسان دووبارە بووەوە: من میزم بە نوینەکەمدا کرد و لیدانیش دووبارە بووەوە. لە بەختی باشم دایکم بە ئالانی فرەویژ و شەیتانی نەگوت کە چم لی قەوماوە. کە ئالان بیزانیبا هەموو کەس دەیزانی. دایکم بە هۆی فرەویژییەوە ناوی نابوو مۆنتی کارلۆ. ئەو لە فرەویـژی و گیـڕانەوە و چیرۆکبیژیدا ڕەقیبی من بوو. بەلام قەت دەرەقەتم نەدەهات. من وەک ئەلعەرەبیە و ئەلجەزیرەم و ئەویش وەک ڕادیۆیەکی بچووکی لۆکالی.

بیرم لە چارەیەک کردەوە کە لانیکەم لە لیدانەکانی دایکم ڕزگارم ببی. بیرم نەدەکردەوە چۆن لە میزکردن ڕزگارم بی. نازانم بۆ؟ لەوانەیە ئەمە لە تواناMدا

نەبووبێ. لێ بیرم لە چارەیەک کردەوە کە لە سایەیدا لە لێدانەکانی دایکم ڕزگارم ببێ. دایکم قەت نەیپرسی بۆچی میزبەخۆمدا دەکەم. گوێی نەدەدایە ئەوە کە هیچ تاوانێکی منی تێدا نییە.

"دەبێ ئەم کارەساتە بۆ دایکم بگێڕمەوە، بەسە ئیتر تێر لێدانم خوارد".

ئەمەم بە خۆم گوت.

لێ بۆ ئەوەی دایکم لێمنەدا دەبێ من بە خۆمدا نەمیزم یان لانیکەم کەس بەمە نەزانێ کە میز بە خۆمدا دەکەم.

***

ئالانی برام سەری لەوە سوور مابوو بۆچی دایکم هەموو بەیانیان لێم دەدا. هەر کە ئەو لە منی دەدا، ئالانیش وەک پشیلەیەکی خەواڵوو لە نێو نوێندا خۆی کۆ دەکردەوە سەر یەک و بێدەنگ دەما. مەیسۆ بێ ئەوەی بزانێ بابەتەکە چییە، دەگریا. پاشان دەهات و خۆی دەخستە باوەشی من و دڵنەوایی دەکردم و دەیویست بیرم بباتەوە. دڵم بۆی دەسووتا، لە باوەشم دەگرت، ماچم دەکرد و دواتر دەستیم دەگرت و هەندێک لە کۆڵان دەمگەڕاند و لە کۆتاییدا کاتێک هەستم دەکرد تووڕەییەکەی دایکم نیشتووەتەوە، دەگەڕاینەوە ماڵێ.

دایکم ناوی نابووم میزکەر و هەموو شەوێک مشەمایەکی گەورەی لە سەر دۆشەکەکەم ڕادەخست. بەمجۆرەش نەیدەهێشت خوریی دۆشەکەکە تەڕ ببێ. ئەمە فیکرەیەکی باش بوو بۆ ئەوە، چونکە ئیدی مەجبوور نەبوو دۆشەکەکەی لەبەر خۆر هەڵخات. بەڵام دەرد و ئازار و زەحمەتیی منی زیاتر کرد. ڕاستە کە مشەما نەیدەهێشت میز بچێتە سەر دۆشەکەکە، لێ وای دەکرد کە میز هەموو لە سەر مشەما وەک گۆلێک کۆ ببێتەوە و منیش تێیدا تا بەیانی گینگڵ بدەم.

من زۆر دڵم بە خۆم دادەما، بەڵام نەمدەوێرا هیچ بڵێم. ئیدی خۆم لە براکەم سەرتر نەدەدیت. ئەو ئیدی هەستی کردبوو کە شتێک هەیە من دەشلەژێنێ. خەمگینیی و بێدەنگییەکەی من سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو. دەهات دڵنەوایی منی دەکرد و دەیگوت: "دڵنیگەران مەبە بۆ بابە، کامۆ، دڵنیا بە دەگەڕێتەوە، بە خودا دەگەڕێتەوە، دە وەرە با یاری بکەین".

من ئیدی نەمدەویست یاری بکەم، تەنانەت نەمدەویست بچمەوە بەر خوێندنیش. هەموو قورسایی خۆم، ئەوەی کە هەموو ئاستەنگیکی لە پێش چاو لا دەبرد، دابووە بابەتەکەی خۆم. تەنانەت ئیدی ڕفاندنی باوکم لە لایەن داعشەوە، لەبیر کردبوو.

"هەرچی دەردە دەرمانێکی هەیە". باوکم هەرجارێ کە دەیدیت من کەوتوومەتە تەنگژە و ئاستەنگی، وای پێدەگوتم.

بڵێی چارەیەک بۆ ئەم کارەساتە لەحنەتییەی منیش هەبێ!

- دۆزیمەوە!

بەیانی ئەمەم بە خۆم گوت.

- ئیدی داییبیەکانی مەیسۆ بە کار دێنم.

بەر لەوەی بچمە نێو نوێن، یەک لە داییبیەکانی خوشکەکەم لە دۆلابەکە دزیبوو و خستبوومە نێو جانتاکەی مەکتەبم. دایکم وەک هەموو جارێ مشەماکەی لە سەر دۆشەکەکەم راخست و هات من و ئالانی ماچ کرد، بەڵام چیرۆکی بۆ نەگێڕاینەوە. کاتێک زۆر هاروهاج بوایەتین وەها سزای دەداین. بەڵام ئیدی خەمی من چیرۆکەکانی دایکم نەبوو. من کەوتبووم بە کۆی چیرۆکی میزکردنی خۆمدا و ئاگام لە هیچ نەمابوو.

بە دزییەوە داییبیەکەم دەرهێنا و گەڕامەوە نێو نوێنەکەم. دوای خەوتنی ئالان، دەرپێ و شۆرتەکەم داکەند و داییبیەکەم لە پێ کرد. چەند ئاسان بوو! ناوقەدی داییبی هەندێک بۆ من تەنگ بوو، بەڵام زانیم کە ئیدی میزی لێ نایەتە دەر. ڕیکلامەکانی تەلەویزیۆنم بیر کەوتەوە. لەو ڕیکلامانەدا، دایکان داییبی هەندێک

مارکەی ناسراویان بۆ منداڵاکانیان دەبەست و منداڵ تێر خەو دەبوو. نازانم چۆنچۆنی چوومە خەو؟ بەڵام وەک هەموو جارێ مەلابانگدان لە خەو هەستام، کاتێک لە خەودا دیتم خەریکم میز بە تایەی لۆرییەکی مەزندا دەکەم. دەنگی گرمەگرمی لۆری منی لە خەو ڕاچڵەکاند. دەستێکم لە ناو لنگمدا بوو، دیتم کە کەمێک تەڕ بووم، کەمێک میز بە ڕانی ڕاستمدا شۆڕەی کردبوو و هیچی دی. بەڵام داییبی پڕ ببوو، قورس ببوو و دەبووا بە پەلە هەستم و فڕێی بدەم.

سەعات پێنجی بەیانی بوو. لەو سەعاتەدا پیاویش نەیاندەوێرا بچنە دەرەوە. هەستام، داییبیەکەم کردەوە و بە دزییەوە چوومە دەرەوە و لە نزیک دەرگای ماڵی خۆمان فڕێم دا و گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم. وەک ئەوەی لە شەڕ یان شۆڕشێکدا سەرکەوتبێتم، بەکەیف بووم. ئالانی برام هێشتا لە خەودا بوو و وەک هەمیشە ڕووی لە دیوار بوو.

لە سەر پشت ڕاکشام و بۆ خۆم دەستم بە ژماردنی ئەو بەرخانە کرد کە خۆیان لە سەر چەمەوە هەڵداوێشت، تا هێدی هێدی هەڵخلیسکامە نێو چەمی خەو.

***

دۆخەکە بەمشـێوەیە درێـژەی هەبـوو تـا کۆپتەرێـک مەیسـۆی خوشـکمی لە ڕۆژی لەدایکبوونیـدا، کوشـت. دایکـم کەوت بە کـۆی ژانـی ئەودا، لە ڕق و قینـدا لاڵ بوو. باپیرە و داپیرەشم، کەوتن بە کۆی کچەکەیاندا یان بـا بڵـێن لەیـلای دایکمـدا. و منـیش سـەرقاڵی میزبەخـۆدا کـردنەکەم بـووم. چـی داییـی لە دوای خوشـکە کوژراوەکەم مابوو، بە کارم هێنا تا تەواو بوون. ئیدی بە دزییەوە دەچووم لەو خەرجییەی کۆم دەکردەوە، داییم دەکڕی. دایکیشم ئیدی بابەتەکەی لەبیر کردبوو.

# باسکیلی سەوز

باوکم لە شەممە بازاڕەکەی منبەج کڕی. باسکیلێکی سەوزی جوان بوو، چرایەکی لە پێشەوە هەبوو و چرایەکی سووری بچووکیشی لە دواوە هەبوو. هەر دوو چراکەش بە دایناموٚیەک کە لە سەر تایەکەی پێشەوە بوو، هەڵدەبوون. هەرچی زیاتر خێرا دەڕۆیشتم، شەوقی چراکانیش زیاتر دەبوو.

زەنگۆڵەیەکی بچووکیش لە لای ڕاستەوە هەبوو کە من بە قامکە گەورەکەم دەنگم لێدەردەهێنا و پیادەکانم ئاگادار دەکردەوە کە سەر ڕێگەم بەر دەن. ڕۆژانی سەرەتا زۆر دوور نەدەڕۆیشتم. لە پێش ماڵی خۆمانەوە تا مەیدانی ترافیک لە لای ڕۆژئاوا، دەچووم و دەگەڕامەوە. خاڵێکی پشکنینی داعش لە نزیک بەنزینخانەکە هەبوو، کە خۆم لێ لادەدا. دواتر گەڕانەکەم فراوانتر بوو.

سەوزە، هەر وەک باوکم ناوی نابوو، لەو ڕۆژەوەی کڕی بووە هاوڕێی من. هەر وەک چۆن ئێستا لەگەڵ تۆ

دانوستان دەکەم، لەگەڵ سەوزەش وەها بووم. من وەها بووم لەو ڕۆژەوەی خودا منی داوە. لەگەڵ شتەکانی دەوروبەرم قسە دەکەم و دەیانکەمە هاوڕێی نزیکی خۆم. چیرۆکی خەیاڵی بۆ ئالان دەگێڕمەوە، کە دایکیشم لێی سەیر دەمێنێ.

- کامۆ کە تۆم بوو چیرۆک لە سەر زمانت بوو.

ڕۆژێکیان دایکم وەهای پێ گوتم، دوای ئەوەی بە چیرۆکێک سەری ئەوم گێژ کرد.

من باسکیلەکەم خۆش دەویست. پێکەوە دەچووینە زۆر شوێن. دەچووینە نێو باخان، دوکانان، مزگەوتان، دەبستان و تەنانەت بە باسکیلەکەم دەچوومە بازاڕیش. ئالانیش هەر بە دوامدا ڕایدەکرد و دەیویست پێم بگاتەوە. چەندە کەیفم دەهات کاتێک دەمدیت ئەو بێچارە بووە و دەگری. جارێکیان ویستم لە پشتەوە سواری بکەم، بەڵام ئەو ترسنۆک بوو، ناوقەدی منی دەگرت و دەیگوشی، نەیدەهێشت جوان لێبخوڕم، میزەڵانیشی دەگوشیم و مەجبووری دەکردم ڕاوەستم، ئەو دابەزێنم و خۆشم دابەزم، بمیزم و بگەڕێمەوە و بۆ خۆم بە تەنیا لێبخوڕم، وەک باڵندەیەک کە تازە فێرەفڕین بووبێ.

* * *

ئەو ڕۆژەی باپیرەم هاتە منبەج کە دایکم ببا، من باسکیلەکەم لە ژێرزەمین هێنایە دەر و هاتم لە لای ئەو تەکسییەی باپیرم لە حەڵەبەوە بە کری هێنابووی، ڕاوەستام.

- ئەو باسکیلە چییە کامۆ؟
- لەگەڵ خۆم دەیهێنم باپیرە.

باپیرەم ڕوخساری گرژ بوو نیگایەکی بڕییە باسکیل و یەکی بڕییە من و ویستی شتێک بڵێ، لێ شۆفیرەی تەکسی ڕێی پێنەدا و گوتی:

- حاجی باسکیلەکە بچووکە، دەیخەینە سندووقەکە و لەگەڵ خۆمان دەیبەین.

باسکیلی لە دەستم وەرگرت و لە سندووقەکەدا جێی کردەوە. من زۆر خۆشحاڵ بووم. وای دانێ من کەسێکم لە مردن ڕزگار کردبێ یان باوکمم لە زیندان ڕزگار کردووە.

- من باسکیلەکەم لەگەڵ خۆم دێنم و تێر و پڕ کۆڵانە خۆشەکانی حەڵەبی پێ دەگەڕێم.

ویستم ئالانی برام توورە بکەم، بۆیە وەهام گوت بێ ئەوەی بزانم چارەنووسی نیشانبڕ چی بۆ ئێمە لە پشتی خۆیدا شاردووەتەوە.

* * *

- ئاگادار بە نیشانەشکێن هەن!

لە حەڵەب ئەم ڕستە پیسەم لە زۆر کۆڵان و شەقام بەرچاو کەوت.

- باپیرە من دەمەوێ باسکیل لێخوڕم.
- نا کوڕم نا. شەڕە و تەقینەوە زۆرە.
- شەڕ و تەقینەوە؟ جا من کارم بەوە چییە؟ مەگەر باسکیل لێخوڕین لە شەڕدا قەدەغەیە؟
- لە شەڕدا ژیانیش قەدەغە دەبێ کوڕم. تۆ هێشتا منداڵی، با گەورە ببی جا لە ڕاستیی شەڕ تێدەگەی.

باپیرەم نەیدەزانی کە ئێمەی منداڵ باشتر لە هەر کەسێک لە شەڕ تێدەگەین. ئێمەی منداڵ ڕاستیی شەڕ دەناسین نەک گەورەکان. لەوانەیە لە ڕوانگەی باپیرەمەوە، بازرگانییەکەی، دووکانەکەی، شوێنی ڕۆنگرتنەکەی یان باخە زەیتوونەکەی بۆی پێویست بێ و باسکیلێکی بچووک لە شەڕێکی مەزندا لای بێقیمەت بێ، بەڵام دەردی من باسکیلەکەم بوو. کێشەی من نەبوو کێ دەسەڵاتە و کێ دژبەر. دەردی من ئەوە بوو کە گەورەکان واز لە ئێمەی منداڵ بهێنن کە بە کەیفی خۆمان بەبێترس یاری بکەین و بچینە دەبستان بێ ئەوەی ئەحمەقیی گەورەکان ڕێگرمان بێ.

هۆ گەورەکان! ئێوە ئێمەتان بۆ ئەوە نەهێنایە دونیا کە بمانخەنە نێو ئاگری شەڕ و ناکۆکیی خۆتانەوە، ئێوە

ئێمەتان نەهێنایە دونیا کە بە ڕقەبەری و کینەوەری بەخێومان بکەن. ئێمە دەزانین کە ئێوە ئێمەتان بۆ کەیفی خۆتان هێنایە دونیا، دە ئیتر کەم منەتبارمان بکەن. بە ئێوە بێ ئێمە منداڵین و قەت هیچ نازانین؟ ئێمە وەک جیلی ئێوە نین کە بەڕێز دەبوون بۆ ئەوەی کیلۆیەک نان، یان قوتوویەک دەسماڵ یان قوتوویەک شیری منداڵ یانیش بوتڵێک گازتان دەست کەوێ.

ئێمە جیلی موبایل و ئینتەرنێتین. ئێمە باش دەزانین شەڕ چییە و بۆچی ئێمە لە شوێنێکەوە هەڵدێینە یەکی دی وەک ئەو پشیلەی بەچکەکەی بە دەمیەوە بێ و لە شوێنێک ئارام بگرێ. پشیلەکەی من هەر ئەم باسکیلە سەوزە بوو کە من لە منبەجەوە لەگەڵ خۆم بردمە حەڵەب و لە حەڵەبیشەوە کۆچبەری شەڕان بووین و لەگەڵ خۆم بردمە شەڕانیش. لەوێ من بە کەیفی خۆم دەگەڕام، بە باسکیل دەچوومە نێو باخان، مەیدانان و تەنانەت جارێک گەیشتمە گوندی سینکا. پاشان خاڵۆم لەگەڵ خۆی بردمیە گوندی جەمان و عەلی بزازانلی لە نزیک چۆمی مەیدانکێ.

جارێکیان بە باسکیلەکەم کەوتمە دوای کۆمەڵێک پیکاپ کە دەچوونە گوندی مەتینا. من و چەند هاوڕێیەک بووین بۆ خۆمان کەوتینە دوایان. فرەفڕی ئالای ڕەنگین بوو و شەڕڤان بە جلی بەڵەکەوە قامکیان بە هێمای سەرکەوتن هەڵدەهێنا و بانگیان دەکرد:

"شەهید نامرن، شەهید نامرن". هەندێکیش لە پێش پیکاپەکاندا دانیشتبوون و دەگریان، هەندێکی دی دەیانلیلاند، ئەوانی دیش چەپڵەیان لێدەدا و سروودیان دەوتەوە. دیمەنێکی سەیری شایانی دابیسان بوو. کاتێک کۆمەڵە پیکاپ گەیشتنە گوند، ڕوویان کردە گۆڕستانی مەزن، لەوێ هەندێک خەڵک کۆ ببوونەوە و گەلێک ئۆتۆمبیلی دیکەش هەبوون. من تێگەیشتم کە بابەتەکە بەخاک سپاردنی شەهیدانە. ئێمە باسکیلەکانمان پاڵ دا بە دیوارێکی گۆڕستانەوە لە نزیک دەروازەکە و چووینە نێو ئاپۆڕەی خەڵکەکە.

پێنج دارەتەرم لە سەر عەزر بوو، پێنج گۆڕیش ئامادە بوون. هەر دارەتەرمێک ئالایەکی ڕەنگینی یەپەگەی تێوە پێچرابوو و لە پێشەوەی دارەتەرمیش وێنەیەکی شەهیدەکە هەبوو. هەندێک ژنی ڕەشپۆش خۆیان دابوو بە سەر دارەتەرمدا و دەگریان. یەکی سمێل ئەستووریش لەوێ بوو و بەڵێنی تۆڵەسەندنەوەی دەدا.

من نزیک دوو پیرەمێرد کە سرتەسرتیان دەهات ڕاوەستابووم، دەنگیان دەهاتە گوێم، یەکیان بەویدی دەگوت:

- کۆمەڵ کۆمەڵ دەیاننێرن بۆ مردن و یەک یەک دەیاننێژن.

و دووکەڵی جگەرەی بەرەوە ئاسمان بەردایەوە.

پیرەمێردەکەی دیکە کە ئەویش جگەرەی دەکێشا، وەڵامی دایەوە:

- دەی تۆ دەڵێی چ بکەن؟ خاک و نیشتمانی خۆیان دەپارێزن.
- جا وڵات لە کوێیە؟ بڵێ کەفەن و گۆڕستان، مەڵێ نیشتمان.

کاتێک شەهیدەکانیان ناشت، دەنگی هەردووکیان بڕا. دەنگ لە گۆڕستان بەرز بووەوە: شەهید نامرن، شەهید نامرن. من هەندێک لە پیرەمێردەکان دوور کەوتمەوە و ئەوانم لە ژێر خێوەتی دووکەڵی جگەرەدا جێهێشت. شەڕڤانێک کە تەمەنی بیست ساڵێک دەبوو، هاتە لای من، دەستێکی بە سەرمدا هێنا و گوتی:

- ئەی تۆ هەڤاڵ! تۆش ناتهەوێ ببیتە شەڕڤانێک و تۆڵەی خوێنی شەهیدان بستێنیتەوە؟

من وەڵامم نەدایەوە. من لە چەک هەڵگرتن و چوون بۆ شەڕ دەترسام. من دەمەوێ بە باسکیلەکەم بۆ خۆم لە نێو مەزرا و باخان بگەڕێم، نامەوێ لە جەبهەی شەڕ بمرم. من هێشتا میز بە خۆمدا دەکەم، کەی بۆ شەڕ دەشێم! من بە کەڵکی شەڕی گەورەکان نایەم. بیستبووم کە گەلێک منداڵ لە تەمەنی مندا چوونەتە شەڕ و نەگەڕاونەتەوە.

دەی با جارێ واز لەم قسانە بێنن تەبەشیری ئازیز. با بگەڕێمەوە بۆ بابەتە بچووکەکەی خۆم، یان با بڵێین باسکیلە سەوزە بچووکەکەم.

***

ئاڵای سوپای تورک لە سەرەتای مانگی ئازاردا بەرەو شەڕانەوە هات. دایکم زۆر دەترسا. هەموو جارێ ئێمەی لە باوەش دەگرت و دەگریا. من گریانەکەیم تەحەمول نەکرد، پێمگوت: هیچ نییە مەترسە. بڕوات بە هەڤالان هەبێ. شەڕڤانەکانمان ئێمە دەپارێزن و ناهێڵن ببینە نێچیری گورگەکان. ئەو زمانی دەرهێنا و گاڵتەی بە من کرد. ڕۆژی سێشەممە پێش لەوەی یەکەم حەفتەی مانگی ئازار کۆتایی بێ، گرووپە چەکدارەکان گەیشتنە ناوەندی ناوچەی شەڕان و لە چەند کاتژمێردا دەستیان بەسەر هەموو ناوچەکەدا گرت.

ئێمە چاوەڕێی شتی وامان نەدەکرد. خەڵک باسی خەندەق و قوڵکە و سەنگەری وایان دەکرد کە بەهێزترین سوپای دونیاش ناتوانێ لێیان دەرباز بێ. ئەو پیاوەم هاتەوە یاد کە لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی پێنج شەهیدەکەدا قسەی دەکرد. ئەو دەیگوت کە چەک و چۆڵ و جبەخانە و ئەرزاقەکەمان بەشی دە ساڵمان دەکا.

دەبوا جارێکی دی ئێمە هەڵبێین و کۆچبەر ببین.

- باسکیلەکەم.

بە کوڵی گریانەوە بە دایکمم گوت.

ئەو بە دەستی خۆی ئیشارەی کرد کە بێ بە ڕێوە، پاشان قامکی ئاماژەی دەستی ڕاستی خستە سەر لێوی وشک و برینگی خۆی کە یانی بێدەنگ بە. دەستی ئالانی برامی گرتبوو و ئێمەی دابووە بەر و ئاوڕیشی نەدەدایەوە.

گەلۆ من چۆن باسکیلەکەم لە دوای خۆم جێ بهێڵم؟ جا چۆن دەبێ من هەڵبێم و پشت لە سەوزە هەڵکەم؟ ئەگەر لەگەڵ خۆم بمهێنابا، هێدی هێدی لێمدەخوڕی و ئەو ئازارە زاڵمە لە لاقمدا پەیدا نەدەبوو. بۆچی نەمهێنا؟

لەو کاتەدا پرسیار منی دایە بەر شەپۆلی خۆی، هەروەکچۆن فڕۆکە شەڕکەرەکانی تورکیان ئاسمانیان تالان دەکرد. ئێمە هەندێکی دی ڕۆیشتین، گەیشتینە گوندێک، خاڵۆم گوتی ئەوە گوندی مەشالەیە. لەوێوە ڕوومان کردە ڕۆژئاوا و چووینە سەر ڕێی عەفرین. خاڵۆم تەمبوورەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. جارجارە کە ڕادەوەستاین هەندێک بحەسێینەوە، تەمبوورەکەی هەڵدەگرت و ئاوازی خۆشی لێدەدا بۆ ئەوەی ئازاری ڕۆیشتن و ژانی کۆچبەریمان بیر بباتەوە.

- ئاخ بۆچی باسکیلەکەم لەگەڵ خۆم نەهێنا!؟

بە ئازارەوە وەهام گوت.

خاڵۆم بەبەر توندکردنی تێلی تەمبوورەوە گوتی:

و پیکاپە بکە. هەزاران چیرۆک هەیە. ئەریٚ.
کۆریدۆری هێمن یان ترس لەوەی کە نەگەیتە
جێی خۆت. ترس لەوەی کە نازانی ڕووت لە
کوێیە.

نازانم ئالانی برام وەڵامەکەی منی وەرگرت یان نا؟ بەڵام لە شوێنی خۆی هەستا و چوو ڕوخساری دانایە سەر کەناری ساردی ترێلی کە بەرەو شارۆچکەی باسووتا دەچوو و بۆ خۆی سەیری درێژایی ڕێگەی پڕ لە کۆچبەری کرد.

من خۆم زۆر ماندوو بووم و لە بێخەویدا گێژ بووم. لە بەر لاقی دایکم خۆی کۆ کردەوە سەر یەک ، سەرم دانایە سەر چۆکی کە بخەوم. ئەویش بۆ خۆی گوێی لە ژنانی نێو ترێلی گرتبوو..

# زەلووخ

لە نزیک باخە زەیتوونێک تەراکتۆر دووبارە ڕاوەستا. ئێمە نەمانزانی بۆچی! ئێمە ئیدی ڕاهاتبووین کە هەر جارە تەراکتۆرەکەمان لە شوێنێک ڕایدەگرێ. کاروان درێژ بوو و ڕێگە تەنگ و هیچی دیش نەبوو.

لە تریلییەکەدا پیرێژنێکی سەیری خەڵکی گوندی بەعدینا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی راجۆ هەبوو ناوی زەلووخ بوو. کەس باوەڕ بە چیرۆکی ئەم پیرێژنە ناکا کە دەمەوێ بیگێڕمەوە. تۆش باوەڕ ناکەی تەبەشیرە خۆشەویستەکەم.

ئەو پیرێژنە داگیرکردنی راجۆ و بەعدینا و گوندەکانی دەوروبەری لە سەرەتای مانگی ئاداردا دیتبوو.

ئەو بێوەژنێکی پیری هەژار بوو. ماڵێکی بەردینی لە داوێنی چیای بەڵەکدا هەبوو بە دەوروبەریەوە نزیکەی سەد دار زەیتوونێک شین ببوو. دایە زەلووخ لەو باخە زەیتوونە بژیوی ژیانی خۆی دابین دەکرد. ئەو تەنیا بوو و منداڵەکانی چووبوونە ئەورووپا. کەس نەبوو کە هاوکارییەکی بکا. تەنیا بێوەژنێکی جوان کە مێردەکەی،

که شەڕڤانی یەپەگە بوو، لە جەبهەی ڕەققە لە شەڕی داعشدا کوژرابوو.

ئەو پیرێژنە دیبووی کە سوپای تورک و چەتەکانی سەر بەو سوپایە بەرەو گوندەکەی هاتبوون. بە خۆی گوتبوو: جا بۆچی هەڵبێم؟ من پیرێکی بێوەژنم و لە شەڕیشدا کەس گوێ ناداتە پیرەکان. لە گوند و ماڵەکەم دەمێنمەوە و هەڵنایەم. پاسەوانیی دار زەیتوونەکانم دەکەم و هەر چیش ڕوو بدا هەڵنایەم. ئەو چیرۆکەکەی بەمجۆرە بۆمان گێڕایەوە:

'لەگەڵ ئەوەی کە فڕۆکەکان دەیانگرماند و تۆپ لێرە و لەوێ دەتەقین، من لە ماڵەکەی خۆمدا مامەوە. بەلام ڕۆژێک لە ناکاو دەنگی خرتەخرتێکی ناخۆش لە بەردەرگای ماڵەکەم هات. هاتمە دەرەوە بزانم چییە، دیتم دوو چەکداری ڕیشڕەش و قژدرێژ لە بەردەرگان.

- چیتان دەوێ؟

لێیانم پرسی. یەکیان وەلامی دایەوە:

- دەمانەوێ ماڵەکەت جێ بهێڵی و بڕۆی. لێرە شەڕە و دەبێ تۆ بچیتە شوێنێکی ئارام و هێمن.

- لە دونیادا لە ماڵەکەی خۆم هێمنتر نییە.

وەلامم دانەوە، ئەوی دیکەیان گوتی:

- ئێمە پێت دەڵێین بڕۆ. ئەمە فەرمانە و دەبێ ئەنجامی بدەی. بڕۆ یانی بڕۆ.

ئاخخخخ ئاخخ. کەسم نەبوو پشتگیریم بکا. هەمووان جێیان هێشتبووم. تەنیا بووم وەک پیرەدارێکی سەر چیای پڵنگ. لە گیانی خۆم ترسام. ئەرێ وەڵڵا ترسام. جا درۆی بۆچییە؟ گیان شیرینە و منیش لەوان ترسام. گوتم: دەڕۆم بەڵام بەو مەرجەی مشتێک زەیتوون لە باخەکەم بچنمەوە و لەگەڵ خۆم بیبەم. گوتیان باشە. جا بۆ نەڵێن باشە؟ چوومە نێو باخەکە. هەردووکیان خۆیان دایە پاڵم. باخەکەمیان پیس کرد. نەمدەویست لە نێو باخەکە بێمە دەر. دەنکە زەیتوونێکم چنیەوە و خستمە لەپی دەستم و گووشیم. وەک ئەوەی ڕۆحم لە دەستمدا بێ.

- دە زوو کە دەی پیرێژن.

هەردوو چەکدار پێکەوە وایان پێ گوتم. دەیانویست بە پەلە لە نێو ئەو دارانە بە ساڵان پێیانەوە ماندوو ببووم، ئاوم دابوون، کێڵابووم و ئاگام لێیان ببوو. دەرمکەن. من خۆم ئەو دارانەم چاندبوو بەر لەوەی ئەو دوو چەکدارە لە دایک ببن. ئاخخخخ ئاخخخ. دوو دەنکی دیکەم چنییەوە. هەستم کرد ئەو دوو دەنکە بە لقەکەیانەوە هاوار دەکەن، داوام لێدەکەن رزگاریان بکەم. هەموو دارەکان، سەرجەم باخەکە بانگ و هاواریان بوو. هەموو باخەکانی عەفرین لە ترسی داگیرکەران هاواریان دەکرد.

- زوو برۆ بەر لەوەی ئێمە بە زۆر دەرت کەین. ئێمە کاتمان نییە بە تۆوە خەریک بین.

پەلەیان لێم کرد. پەلەیان لە مردنی من کرد، لە جێ هێشتنی گەوهەری گیانم. چەند دەنکی دیکەم چنییەوە. لە بەر دارێک ڕاوەستام و گریام. ئەو دارە مێردەکەم بەر لەوەی بمرێ چاندبووی و سپاردبوویە من. هەر دارێکی ئەو باخە چیرۆکێکی هەبوو. ئەگەر چیرۆکەکانیان بگێڕمەوە بە ساڵێکیش تەواو نابێ. ئەو چەکدارانە چیرۆکی دارەکانیان نەدەزانی. ئەو ڕۆژە چیرۆکی دارەکان بۆ ئەوان گرینگ نەبوو. گرینگ بۆ ئەوان خودی دارەکان بوون. دەیانویست هەموو شت بۆ ئەوان جێ بهێڵم و بڕۆم. هەردووکیان پەلاماریان دام، دەستمیان گرت و لە باخەکەم دەیانکردم. دەترسام زەیتوونەکانی نێو دەستم دەربێنن. مشتم توند قووچاند و دەنکی دڵیشم لە ئازاردا هێڕدرا. چەتەکانو مەعسەرە بە مەعسەرە تاڵانیان کرد. بە هەزاران تەنکەی زەیتیان دزی. من دیتم کە چۆن باری تریلیی تەراکتۆری دەکەن و دەیبەن. ئەوان تەراکتۆرەکانیشیان دزیبوو. باخە زەیتوونەکانیان سووتاند. من گریانی زەیتم بە گوێی خۆم بیست. ئێوەش ناڵەناڵی زەیتتان نەبیستووە؟ ئەرێ وەڵڵا. زەیتیش دەناڵێنن. ناڵەناڵی زەیتیش ڕوونە وەک زێڕ.

خالۆ گوتی:

- پووره زەلووخ هۆشی لە سەر خۆی نییە قسە دەکا. لە زەیت بێدەنگتر هیچ نییە. چون زۆر خەستە، کاتێک دەیکەیتە نێو زەرفەکان هیچ دەنگێکی لێوە نایە.
- بەڵام کاتێک شتێکی تێدا سوور دەکەیتەوە دەست بە قرچەقرچ دەکا.

وەک ئەوەی شتێکی سەیرم کەشف کردبێ، ئەمەم گوت.

خاڵۆم ئاوڕی لێدامەوە، دەستی ڕاستی لە سەر دیرەکسیۆن هەڵگرت، ڕایوەشاند وەک ئەوەی بیەوێ لێمبدا، بەڵام دەستێکی بە سەرمدا هێنا و گوتی:

- ئەو قرچەقرچەی دەیبیسی دەنگی ئەو شتانەیە وا سوور دەبنەوە، هاواری ئەوانە نەک دەنگی زەیت.
- پووره زەلووخ درۆ دەکا؟
- نا درۆ ناکا. زەیتیش ناڵەناڵی هەیە. ناڵەناڵێک وەک زیڕ بریقەی دێ وەک خۆی دەڵێ. ئەوە ڕاستە
- یانی چۆن؟

لە خاڵۆمم پرسی. دەستی بە بۆڵەبۆڵ کرد و گوتی:

- کەی بێدەنگ دەبی کامۆ؟
- هەر کاتێک فڕۆکەکان بێدەنگ بوون، منیش بێدەنگ دەبم.

- فرۆکەی حیز، ڕۆکێتی وەک کێری تۆ نابینن کە بێدەنگیان بکەن. بەڵام تۆ! نامەوێ ئیدی هیچ ببیسم. تێگەیشتی؟ واز بێنە با ئەم تەراکتۆرە بگەیەنمە ئامانجەکەی.
- وەڵا خالۆ تێنەگەیشتم. بەڵام وای دانێ تێگەیشتم. بەڵام توخوا ئامانجی ئەم تەراکتۆرەت چییە؟
- ئامانجی ئەوەیە گوو بکات بەم شەڕەدا. دە بێژە تێنەگەیشتم با تێتگەیەنم. تێگەیشتی؟

کاتێک دیتم ئیدی مەسەلەکە گاڵتە نییە و خالۆم زۆر تووڕە بووە و حەز ناکا هیچ بڵێم، گوتم:

- ئەرێ خالۆ تێگەیشتم. باش تێگەیشتم.

***

دوای ئەوەی پوورە زەلووخ بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە، بێدەنگ و خەمگین لە پێشەوەی تریلی دانیشت. دلم بۆی سووتا. جارجارە نیگایەکم تێدەبڕی و سەیری خەمگینییەکەیم دەکرد.

تەراکتۆر هێدی هێدی دەڕۆیشت. کاروانی کۆچبەران گەلێک درێژ بوو. خوناوکەی باران ڕانەدەوەستا و دەنگی مەکینەی تەراکتۆریش لە گوێی ئێمە نەدەبڕا.

دوای چەند سەد مەترێک تەراکتۆر رایگرت. کاتێک دیسان سەیری پوورە زلێخام کرد، چاوم بە شتێکی

سەیر کەوت؛ پێستی پووره زلێخا هێدی هێدی سەوز دەبوو. ڕوخساری پڕ چرچ و لۆچی سەوز ببوو، پاشان سەوازیی دەستەکانی گرتەوە، جلەکانی و چاوەکانیشی سەوز دەبوون.

ئەو فرمێسکانەی لە چاوەکانی بەرببوونەوە وەک دەنکە زەیتوونی ورد دیار بوون.

ترسام.

ترسەکەم بە خاڵۆم گوت. پێکەنی و گوتی:

- ئادەی سەیری ئاسمان بکە!

سەرم هەڵهێنا چیم دیت! ئاسمان وەک ستادیۆمێکی لێهاتبوو.

لەپڕ دیتمان پووره زلێخا هەوڵ دەدا لە ترێلی دابەزێ. وەک باڵۆنێک خڕ دەبووەوە. من بە چاوی خۆم دیتم خەریکە وەک دەنکە زەیتوونێکی گەورەی سەوزی لێدێ. پووره زلێخا ئەو ژنەی کە لە گوندی بەعدینا هەڵاتبوو، وەک دەنکە زەیتوونێکی لێهات و لە ترێلی کەوتە خوارەوە و وەک تۆپی فوتبۆڵی ئەمریکی تلی خوارد.

# فریالی ئێزدی

فریاڵ ژنێکی ئێزدی خەڵکی قەستەل جندۆ بوو. کاتێک ویستم لە تریلیدا بخەوم، پێی ئاشنا بووم. ئەو بەسەرهاتی خۆی بۆ دوو پیرێژن کە هەرکامیان بەتانییەکی ئەستووری تورکییان لە خۆوە پێچابوو، دەگێڕایەوە.

- هەر کە سوپای ئازاد شەش ساڵ پێش ئێستا عەزازی گرت، ترس باڵی بەسەر قەستەل و گوندەکانی دیدا کێشا. من تازە لە کۆلێژی یاسای زانکۆی حەڵەب دەرچووبووم.

فریاڵ ئەمەی گوت، یەک لە پیرێژنەکان باوێشکێکی دا و وەڵامی دایەوە:

- کچم ئەی ئێوە لە گوندەکەتان مانەوە؟
- ئێستا باسی ئەوەش دەکەم. ئێمە ترساین کە چەکدارەکان ڕوو بکەنە لای ئێمەش. ڕۆژێک چەند چەکدار هاتنە گوند و گوتیان کە ئێمە کافرین و دەبێ ببینە موسڵمان. بەڵام ئیدی قەت

نەهـاتنەوە و ئـێمەش لە گونـدەکەمان مـاینەوە. کوڕ و پیاو چەکیان هەڵگرت بۆ ئەوەی ئامادە بن بۆ هەر هێرشێکی نەخوازراو. دواتر یەپەگە دامەزرێنرا. ئێمەش لە ماڵی خۆماندا ماینەوە و نەبووینە کۆچبەر.

- شوکری خوا کە ئێوە مانەوە.
- بەڵام ئەمجارەیان داعش عەزازی داگیری کرد.
- ماڵی داعش وێران بێ. ماڵیان وێران بێ کە ماڵی خەڵکیان وێران کرد.

پیرێژنەکەی دی قسەکانی فریاڵی بە باوێشکێک بڕی. فریاڵ بزەیەکی کرد. کە سەیری دایکمم کرد دیتم بە خەمگینـی گـوێی لە بەسـەرهاتی فریـاڵ گرتـووە. بە ڕوخسـاریدا تێگەیشتم کە بە مەراقەوە چاوەڕێی کۆتایی بەسـەرهاتەکەیە. منـیش وەهـا بـووم. هەوڵمـدا بە پیرێژنەکـان بڵێم: دایە گیـان لە دەورتـان گەڕێـم قسـەی ئەم خـانمە مەبـڕن. ئێـوە پێویسـتیتان بە خەوە نە بە بیستنی بەسەرهاتەکان. بەڵام دیسان چاوم دانایە سەر یەک و گوێم دایە قسەکانی فریاڵ کە دوو پیرێژنەکە لە مەودای ڕستەیەک تا یەکی دیدا دەیانبڕی.

فریاڵ بەمشێوەیە درێژە بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە:

- با سـەرتان نەیێشـێنم. پاشماوەی بەسـەرهاتەکە بە کـورتی دەگێـڕمەوە. ئێـدی داعشـەکان هێرشیان دەکردە سـەر گوندی ئێمە و گوندی

قتمێ. ئەوان دەیانویست ئەم دوو گوندە ئێزدییە داگیر بکەن.

- دەی هاتنە نێو گوند؟
- نا، بەڵام هەندێک تەق و تووق دروست بوو. زۆربەی کوڕانی گوند چوونە نێو یەپەگە. جەعفەری دەزگیرانیشم ون بوو.
- ئەی خۆت ناوت چییە کچم؟
- ناوم فریاڵە. من پارێزەر بووم.
- ئەی هێشتا دەزگیرانەکەت لەگەڵ ئەوانە؟

یەک لە پیرێژنەکان دیسانەوە قسەکانی ئەوی بڕی، بێ ئەوەی بزانم کامیانە، بەڵام لە قسەکانیەوە زانیم کە دیسان باوێشک دەدا. فریاڵ بە ئارامی و خەمگینی وەڵامی دایەوە:

- پووریێ گیان هەمووی دەگێڕمەوە، تەنیا تۆ دەرفەتم بەیتێ بە کەرەمی خۆت.

لە دڵی خۆمدا گوتم: "خۆزگە ئەم دووانە لە بری دایکم کە مامۆستای ئینگلیزی بوو، لاڵ بوایەتن. بێگومان ئەو کات چێژی قسەکردنی دایکم و فریاڵی پارێزەی جیاواز دەبوو." و دیسان چاوم کردەوە. دایکە لاڵەکەم بە هەموو هەستەکانیەوە گوێی بۆ فریاڵ ڕاگرتبوو. سەری خۆی بردبووە پێشەوە و روخساری خەمگینی خۆی دانابوو سەر لەپی دەستی ڕاستی. دیار بوو قسەکانی فریاڵ کە باسی خوێندن لە زانکۆی

حەڵەبی دەکرد، زیاتر سەرنجی ئەوی راکێشابوو. دوو پیرێژنەکەش تەسلیمی خەوێکی قورس ببوون، ئیدی پاڵیان دابوو بە ئاسنی ترێلییەوە و خەوتبوون. فریالی پارێزەریش بە ئارامی لە گێڕانەوە بەسەرهات بەردەوام بوو. لە دایکمی ڕوانی و گوتی:

"دەزگیرانەکەم لە دژی داعش شەڕی کرد و لە جەبهەی یازیباخی نزیک سنووری تورکیا شەهید بوو. من پشتم شکا. ئێمە پلانمان دانابوو سەری ساڵی نوێ زەماوەند بکەین. واتا مانگێک پێش شەهیدبوونەکەی. بەڵام ئەویش وەک سەدانی دیکە شەهید بوو و لەگەڵ کۆمەڵێک شەهیدی دیکە لە گۆڕستانی شەهید ڕەفیق لە گوندی مەتینا بە خاک سپێردرا. دوای شەهید بوونی ئەو ئێمە هەڵهاتین بۆ گوندی قتمی. لەوێ ماینەوە تا ئەو کاتەی داعش لە ئەلعەزەز دەرکرا. بەڵام دۆخەکە زۆر باش نەبوو. بەردەوام دەترساین. بە ترسەوە دەچووینە خەو و بەترسەوە بەخەبەر دەهاتین. لەژێر سێبەری ئەم ترسە بەردەوامەدا، من شووم کرد. خۆزگە نەمکردبا.

مێردەکەم دوو ڕۆژ پێش لە هێرشی تورکیا چووە ڕاجۆیێ بۆ دانەوەی هەندێک قەرز. زۆرم پێگوت کە نەچێ. هەرچیم کرد و کۆشام بە قسەمی نەکرد. گوتم مەچۆ، شەڕە و گورگەکان ددانیان ڕیچ کردووەتەوە، کەچی لقی زەیتوون بەڕووماندا دەشەکێننەوە. بەڵام ئەو

گوێی نەدایە قسەکانم. ڕۆیشت و ئیدی هیچ هەواڵێکی نەبوو. بڵێی گرتبێتیان؟ کوشتبێتیان؟ هەڵاتووە بۆ شوێنێکی دی؟ نازانم. ئێمە دیسان هەڵهاتینەوە بۆ قتمێ. دوو ڕۆژ دوای هەڵاتنی ئێمە گوندی قەستەڵیان داگیر کرد. لە قتمێش بۆمبا کەوتە دوامان. ئێمەش هەر فریا کەوتین هەندێک جل و بەتانی هەڵگرین و هەڵبێین بۆ عەرشقیبار لە باکووری عەفرین بۆ لای خزمەکانمان. لە عەفرینیشەوە کە ئیدی خۆت تەواوی چیرۆکەکە دەزانی خوشکێ."

دایکم بە دوو فرمێسک وەڵامی دایەوە. فریاڵی پارێزەوە بە نیگایەکی خەمگین لێی ڕوانی و لەپڕ گوتی:

- بببوورە خوشکێ. لێم ببوورە وا دیارە من ئێش و ئازارەکانی خۆمم گشت هەڵڕشت، کەچی هێشتا ناوت نازانم!
- ناوی لەیلایە. دایکی منە. لاڵە.

فریاڵی پارێزەر زۆر خەمگین بوو بۆ دایکم. خەمگینی لە چاوە ڕەشەکانیەوە فیچقەی کرد. یەکسەر دەسماڵێکی هەڵگرت و دایە دەستی دایکم و پاشان بە ئارامی هەستا. من دەستبەجێ سەرنجم دایە زگی زۆر گەورە بوو. ئەو دووگیان بوو. "هەر ئەمەمان کەم بوو لەم کۆریدۆرە ئارامەدا". لەبەر خۆمەوە وەهام گوت و خەوێکی قورس دایگرتم.

# باسکیلی سەوز

بەخێرایی باسکیلە سەوزەکەم لە سەر ڕێگەی خۆڵەکە کە هەردوو کەنارەکەی داری سپیداری لێبوو و ئاسمانیان لە چاو دەشاردەوە، لێدەخوڕی. زۆر کەیفخۆش بووم. باسکیلم لێدەخوڕی و خێراتر دەڕۆیشتم، تا ئەوەی هەستم کرد زۆری نەماوە بفڕم. لەپڕ خاڵیکی پشکنین لەپێشمدا سەوز بوو. پڕ بوو لە کەسی چەکدار. ڕێگەی گەڕانەوە و هەڵاتن لە پشتمەوە بەسترابوو. هەندێکی دی چوومە پێشەوە. ئاڵای تورکیام دیت کە لە پاڵ ئاڵای شۆڕشی سووریا دەشەکایەوە. هەندێک ئاسوودە بووم و لە دڵی خۆمدا گوتم: شکور خاڵی پشکنینی داعش نییە. من هێشتا منداڵم و دەتوانم بە ئاسانی تێپەڕ بم.

بەرلەوەی بگەمە خاڵی پشکنین، زۆر میزم دەهات. دەی ئەمجار چی بکەم؟ سەرم لێشێوا. ڕاوەستم میز بکەم و دواتر بڕۆم؟ یان سەرەتا بچمە خاڵی پشکنین و داوا لە چەکدارەکان بکەم ڕێگەم بدەن میز بکەم؟

لەپڕ دەنگێکی تووڕە و وشک هاتە گوێم:

- لە جێی خۆت ڕاوەستە!

ڕاوەستام.

بە تەواوی لە بەرمیلەکانی خاڵی پشکنین نزیک ببوومەوە. ڕەنگی ئاڵای شۆڕشی سووریام دیت بەسەر بەرمیلەکانەوە. لە ژوورێکی بچووکیش دەنگی گۆرانییەکی تورکی دەهات و ئاویتەی گرمەگرمی فڕۆکەکان دەبوو.

پیاوێکی ریشگرژ بە جلی بەڵەکی سەربازییەوە لە پێشم ڕاوستا. فەرمانی باسکیلەکەمی گرت و بە تووڕەییەوە پرسی:

- ئەم باسکیلەت لە کوێ دزیوە؟
- نەمدزیوە. هی خۆمە. باوکم بۆمی کڕیوە.
- هەی نەحەلەت لە باوکت. درۆزن. ئەمە باسکیلەکەی حەمزەی کوڕمە.

ئینجا بە زللە بەر بووە سەروچاوم. ئەوەندە توند لێی دەدام کە لە ترسان میزم بە خۆمدا کرد.

***

چاوم کردەوە دیتم هێشتا لە تریلییەکەدام. یانی ئەوە ڕەشەخەون بووم دیبووم! ڕەشەخەونێک لەوانەی کە هەموو شەوێک دەیبینم.

فریاڵ دەهات و دەچوو. ماڵباتی خاڵۆ نەعسۆ و هەردوو پیرەکەش هێشتا خەوتبوون. دایکیشم خەوتبوو. لە ژێر پانتۆڵە جینزەکەمەوە دەستم برد بۆ ناو پام. تەڕ ببوو. هەموو لە خەودا بوون، بەلام

نەمویست هەستمە سەر پێ. ئەگینا فریال چاوی بە من و پانتۆڵە تەڕەکەم دەکەوت. ئالانیش هەستی پێدەکرد، لەوانە بوو خالۆشم. چی بکەم؟ ئەو ڕازەی کە چەند ساڵە دەیشارمەوە لەم ترێلییە بەویومنەدا ئاشکرا دەبوو.

- ئالان!
- چییە کامۆ؟ لە خەو هەستای؟
- نا هێشتا خەوتووم.
- چیت دەوێ؟
- تینوومە، ئەو مەسینەی ئاوەم بۆ بێنە.

ئالان دەستی لە لێواری ترێلییەکە کە خۆی پێوە گرتبوو، بەردا و هات مەسینەی ئاوەکەی بۆ هێنام. مەسینەکەم لە دەستی گرت و وامنواند کە ئاو دەخۆمەوە. هەموو ئاوی ناو مەسینەم ڕژاند بەسەر پانتۆڵەکەمدا و دەستم بە جنێودان کرد.

پانتۆڵەکەم یەکسەر تەڕ بوو، ئاوی مەسینە تێکەڵی میز بوو. پلانەکەم سەر کەوت. مەسینەی والام دایە دەست ئالان و بە دەنگێکی نزم بۆ ئەوەی فریال نەبیسێ، گوتم:

- هەی لە کوریدۆری ئارام نێم.

***

ئیدی تێگەیشتم لە هەر ئۆتۆمبیلێکدا، لە هەر ترێلیی تەراکتۆرێکدا، دەردێک هەیە. لەوانەیە لەم کاروانە درێژە

خەمگینەدا خەڵک هەبن دەردەکانیان لە هی ئێمە زۆرتر و قورستر بن.

- تالان بۆ ئێل شاییە.

نازلییەی داپیرم، ئەو کاتەی هێشتا لە حەڵەب بووین، بەردەوام ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە و دەیویست بەمشێوە باری ئازارەکانی سەرشانی دایکم سووک بکات و پێی بڵێ هەزاران کەسی ونبوو وەک باوکم هەیە.

قسەکەی داپیرەم ڕاستە. ئازاری گەورە کاتێک بەسەر هەزاران کەسدا دابەش دەبێ، سووکتر دەبێتەوە. مرۆڤێک بە تەنیا خۆی ناتوانێ کارەساتێک وەک عەفرین بخاتە سەر شانی خۆی. بۆیە ئەم کارەساتە بووەتە بەشی هەزاران کەس. ئەگەر ئەم ئازارە پشکی کەسێک یان چەند کەس بێ، هەموو تەبەشیری دونیا بەشی تۆمارکردنی ئەو ئازارە ناکات.

***

خاڵۆم پاڵی دابوو بە کۆتەی دار زەیتوونێکی پیرەوە و سەیری تەلەفونەکەی دەکرد. چوومە پاڵی. لە تەنیشتی دانیشتم و لەگەڵی سەیری شاشەی تەلەفونەکەیم کرد.

کاناڵێکی تەلەفزیۆنی، ڕاپۆرتێکی تێر و تەسەلی دەربارەی تالانکاریی چەتە چەکدارەکان لە عەفرین و

گوندەکانی دەورووبەری، پیشەکەش دەکرد. لە دیمەنێکدا، کە تەنیا نیو خولەک بوو، باسکیلەکەی خۆم لە باوەشی چەکدارێکی لیوای ئەلحەمزەدا دیت. جلی بەڵەکی لەبەر بوو و ڕیشێکی ڕەش ڕوخساری شاردبووەوە. چاوی بڕیبووە کامێرا و زەردەخەنەیەک لە سەر لێوی بوو. بە دەستێکی ناوقەدی باسکیلی گرتبوو و بە قامکی دەستەکەی دیکەی هێمای سەرکەوتنی بەرز دەکردەوە و بانگی دەکرد:

- غەنیمەی ئێمە. ئەو دەسکەوتانەی لە کوردانی گاورمان وەرگرتووە. شوکری خوا کە سەرکەوتنی کردە پشکی ئێمە.

خاڵۆم چاوی دەرپەڕی. دەنگی هەڵهێنا:

- سەرکەوتنی چی قەحبە دایک؟ سەرکەوتنی چی؟

منیش کە ئەو دیمەنە ساردی کردبوومەوە، قیڕاندم:

- باسکیلەکەی منیان دزیوە.
- سەوزە؟
- ئەرێ دزیویانە. من باسکیلەکەی خۆم وەک لەپی بەری دەستم دەناسم.

و قامکم خستە سەر باسکلیە سەوزەکەی نێو باوەشی ئەو چەتەیە، پێش لەوەی خاڵۆم ڤیدیۆکە بکوژێنێتەوە.

- ئێمە سەر کەوتیییین.

ئەو چەتەیە کە ناوقەدی باسکیلەکەمی گرتبوو، دیسان هـــاواری کـــرد. ئەو پیـــاوەی لە خەودا بینیبـــووم و شـەپازلەیەکی لێدام و وای کـرد میـز بە خۆمـدا بـکەم، خـودی خـۆی بـوو. ئەم هـاوارەی کـرد و هاوڕێیـانی دەستیان بە گۆڤەند کرد و ئاهەنگی سەرکەوتنیان گێڕا.

دووکانیان تاڵان کردبوو، تەنکەی زەیت، کۆمپیوتەر، ســەلاجە، جلشــۆر، بەتــانی، جـل و ماتۆرســیکلێت و ئۆتۆمبیـل و تەراکتـۆر و هەمـوو شـتیان تـاڵان کردبـوو. هەموو عەفرینیان دابووە بەر تاڵان.

خاڵۆم ددانی کرۆشت و دیسان گوتی:

- سـەرکەوتنی چـی کـوڕێ قەحـبە؟ سـەرکەوتنی چی؟

- ســـوورییەکان هەمـــوو ســـەرکەوتوون خـــاڵۆ. هەموو لە بەرانبەر یەکدی سەرکەوتن.

وەهـام بە خـاڵۆم گـوت. ئەو ڕێـگەی بە فرمێسـکەکەی خۆی گرت و گوتی:

- ڕاســتە کــامۆ ڕاســتە. هەمــوو ســوورییەکانی سەرکەوتن. هەمووشیان دۆڕان خوشکەزا. هیچ گرووپێکی سەرکەوتوو نەماوە کە نەدۆڕێ. هیچ میللەتێــک، تــایفەیەک و ئایینێــک نەمــاوە کە نەدۆڕێ، کە ســەرنەکەوێ. ئەوانەش کە شــەڕی یەکتـر دەکەن، تـا ئێسـتاش بەمە نـازانن. ئەوەی خــۆی بە ســـەرکەوتوو دەبینـــێ، لێوانلێـــوە لە

قورپبەسەر و بێوەژن و دایکی جەرگسووتاو و هەتیو و ونبوو و گرتووەکان. دۆڕاوەکانیش هەروەها. ئینجا چ جیاوازییەک هەیە لە نێوان سەرکەوتوو و دۆڕاوی شەڕەکاندا؟ ئەگەر ئەنجامەکە یەک بێ، جیاوازی چییە ناوت سەرکەوتوو بێ یان دۆڕاو؟

من بە لەقاندنی سەر وەڵامی پرسیارەکەی خاڵۆم دایەوە و بیرم لە باسکیلە سەوزەکەم دەکردەوە. بیرم لەوە دەکردەوە کە کێ لە شەڕانەوە هێناویەتە عەفرین؟ بڵێی ئەوە بەڕاست باسکیلەکەی من بێ یان یەکێ وەک ئەوە؟ نا هینەکەی خۆمە. من باسکیلەکەم دەناسمەوە بە زەنگۆڵەی لای ڕاستی فەرمانەکەیەوە، بە نەوارە ڕیشاڵ ڕیشاڵەکەی هەردوو دەسکی فەرمانەکەیدا و بە گەلێک نیشانەی دیکەدا باسکیلە سەوزەکەم دەناسمەوە.

کەواتە ماڵە خاڵوانم تاڵان کراوە!

شتی هەرە قورس بۆ ئێمە ئەوە بوو کە کەلوپەلەکانمان، بەتانی، جل و هەموو ئەو شتانەی جێمان هێشتبوو، تاڵانیان کردبوو.

- ئەوە باسکیلەکەی منە خاڵۆ، دزیویانە.
- ئەوەی شۆڕشێک بدزێ، هەموو شت دەدزێ.

خاڵۆم بە خەمێکی قووڵەوە وەهای گوت. من لێم پرسی:

- مەگەر شۆڕشیش باسکیلە کە بدزرێ؟

خاڵۆم بێدەنگ مایەوە.

***

مـن لە دیتنـی ئەو زەلامە چەکـدارە لەو ڤیـدیۆدا کە باسکیلە سەوزەکەی منی لە ئامێزدا بوو، سەیر مام. ئەو هەر لەو پیـاوە دەچـوو کە لە خەودا بینیبـووم. سـەیرە! جا چۆن شـتی وا دەبێ؟ نـازانم! بەڵام بـاش دەزانـم کە پیاوی جل بەڵەکی ڕیش‌ڕەش، واتـا ئەو دزەی کە بزەی بەدەم کـامێراوە دەکـرد و فەرمـانی باسـکیلەکەی منـی گرتبـوو، کەیفخـۆش بـوو کە باسـکیلەکەی دەبـرد بـۆ کـوڕەکەی خـۆی. ئەو کـوڕەی کە لە یەک لە شـارەکانی سووریا چاوەڕێی ئەو بوو. لەوانەیە لە ئەلـعەزاز یان لە حەڵەب. لەوانەشـە جیرانێکـی ئـێمە بـێ لە منـبەج. یـان لەوانەیە کـۆچبەرێکی خەڵکـی خووتـای بـێ و وەک مـن نیشـتەجێی کەمپی کـۆچبەران بێ لە ئیدلب. بۆ نمـوونە کەمپی ڕوومەت. ئاخ ناوی ئەو کەمپانە چەنـدە دەمخـاتە پێکەنـین؛ کەمپـی ڕوومـەت، کەمپـی بەرخـۆدان و کەمپـی نازانم چی.

ڕاستە من نازانم باژێڕی ئەو چەکدارەی باسـکیلەکەی منی دزی لە کوێیە، بەڵام بـاش دەزانـم کە کورەکەی بە هیـوای گەڕانەوەی بـاوکیەتی لە شــەڕ، هەر وەکچـۆن منیش ئێستا بە هیوای گەڕانەوەی باسکیلە سـەوزەکەمم

و به هیـوای گەڕانەوە دوکـوتر فەرهـادی جەڕاح، واتـا باوکمم.

ســـەرنجمی ڕاکێشـــا کە ژنەکەی خـــاڵۆ نەعســـۆ لە مێردەکەی نەدەپرسی، به خاڵۆمم گوت:

- بڵێی سەرنجی نەدابێ کە مێردەکەی دیار نییە؟

- بەڵێ. بەڵام زۆر گوێ ناداتە ئەمە. ئەمە شتێکی زۆر ئاسـاییە لە شـەڕەکاندا کە کەسـێک لە خەو هەڵسـتێ و ببینـێ کەسـێک دیـار نیـیە. شـتەکە پێویستی بە پرسیار نییە.

لەو ســاتەدا دەنگـی ژنەکەی خـاڵۆ نەعسـۆ هـات کە بانگی خاڵۆ عەلیمی دەکرد:

- عەلی نەعسۆ چووە بۆ کوێ؟

خاڵۆم وەڵامی دایەوە:

- بۆ کارێکی گرنگ چووەتە عەفرین. بەمزووانە دەگەڕێتەوە.

و هەستا کە دیسان تەراکتۆر لێخوڕێ. منیش لەگەڵی هەستام. دڵم بۆ باسکیلەکەم ختووکەی دەهات. خاڵۆم هەسـتی بەو خەمگینیـیە کـرد کە دیمەنەکـانی دزینـی باسکیلەکەم لە ڕاپۆرتەکەدا لە ڕوخساری مندا دایذابوو. ویستی دڵنەواییم بکات، گوتی:

- خەم مەخـۆ کـامۆ. گرنـگ ئەوەیە کە ڕۆحـی خۆمـان ڕزگـار کـرد. ئەگەر لە گونـد بمابـاینەوە ئەو چەکدارانە ڕۆحیشیان تاڵان دەکردین.

من هیچم نەگوت.

دەمانبیست گەلێک کەس باسی تالانی گشتی دەکەن. زۆر کەسیش وەک من شتە تالانکراوەکانی خۆیان دەناسییەوە. ئەوانە زۆر توورە دەبوون، بەلام هیچیان لە دەست نەدەهات. ئەوان پشتیان لە عەفرین دەکرد کە تالان دەکرا، لە دڵیشیاندا ئازاری وا هەبوو کە وشە تێری دەربڕینیان ناکا.

لە دوای گوندی کیمار، بە سەدان کۆچبەرم دیت کە بە قەراخی ڕێگەکەدا دەڕۆیشتن، ژن و پیاوی پیر کە دەستی منداڵەکانیان گرتبوو. لەوانەشە منداڵ دەستی ئەوانیان گرتبوو! بە نێو قوڕوچڵپاودا دەڕۆیشتن. ئەو قوڕوچڵپاوەی دەرەنجامی باران بوو. سەریان داشۆڕابوو. ئەوان سەریان هەڵنەدەهێنا، تەنانەت ئەو کاتەی فڕۆکە تورکییەکان بە ئاسماندا دەفڕین، سەریان هەڵنەدەهێنا. بێگومان ئەو کۆچبەرانە خاوەنی ئەو تەراکتۆر و پیکاپ و ئۆتۆمبیل و ماتۆرسیکلێتانە بوون کە تالانکەرانی عەفرین دزیبوونیان. ئەو تالانکەرانە لە پێش کامێرای تیڤی و وێنەهەڵگرەکان بە بێشەرمییەوە دەریاندەبڕی کە ماڵ و موڵکی خەڵکی عەفرین تالان دەکەن.

دەیانگوت کە خەڵکی خووتای، خووتای لە ڕۆژهەلاتی باژێڕی شام لە ماڵەکانی عەفریندا نیشتەجێ دەکەن. ئێمە قەت بڕوامان بەمە نەدەکرد.

- ئەو خووتایەی ئێمە بۆ خەڵکەکەی گریاین، ئەو خووتایەی کە ئێمە لەگەڵ برسیبوونی خەڵکەکەی برسی بووین، جا چۆن دانیشتوانەکەی دێن و ماڵەکانی ئێمە داگیر دەکەن و باخ و بێستانەکانمان تالان دەکەن و تێیدا دادەنیشن؟ خودا ئەمەی وتووە یان پێغەمبەرەکەی؟ مەگەر شۆڕش وەهایە؟ تالان و دزی و دەستگرتن بەسەر ماڵ و موڵکی خەڵکدایە شۆڕش؟ ئێمە لە کۆلانان وەک لێبووک دەڕەخساین و گۆرانیمان بۆ خووتای دەگوت. ئەمە بوو وەلامی ئێمە؟ ئێمە بە ناو گڵ و قوڕ و پیساییدا هەڵبێین و نەزانین ڕوومان لە کوێیە و ئەوانەی کە دروشممان بۆیان دەگوتەوە بێن و بە ئاسوودەیی بچنە نێو ماڵەکانمان؟

پیرەمێردێکی لە قوڕچەقیو ئەمەی گوت و درێژەی بە ڕۆیشتن دا.

- تۆ ئەو پیرەمێردە لەقوڕ چەقیوەت ناسییەوە؟
- نا. من لە عەفرین کەس ناناسم.
- ئەو پیاوە خاوەنی دوو کۆستەر (مینی باس) بوو کە لە خەتی عەفرین – ڕاجۆ و عەفرین – باسووت کاریان دەکرد. ئەو کاتەی هێشتا لە ماڵی خالۆ نەعسۆ بووین، جارێک لە گەراج

دیبـــووم. به هاوڕێکـــانی دهگـــوت: "ههر دوو کۆستهرهکهی حهفتهی پێش چوونهته ڕاجۆ و نهگهڕاونهتهوه. بێگومـــان چهتهکـــان دهســـتیان بهسهردا گرتووه. بهڵام شوکر که دوو پێم ههیه و دهتوانم پێیان بڕۆم." کامۆ! دهزانی ئهگهر ئهو وهحشـییانه بیانتوانیبـا، پێـی خهڵکیشـیان تـالان دهکرد؟

# کاروانێک لە دایک دەبێ

ئەو شەوەی گەیشتینە باسووت لە نێو باخە هەنارێک لە نزیک گردە بەردینەکانی ڕۆژهەڵاتی شار خەوتین. من و دایکم و ئالان و فریالی پارێزەر و دوو پیرەکە و ماڵباتی خاڵۆ نەعسۆ کە هێشتا خەوتبوون، وەک مشک لە ترێلییەکدا چووبووینە خەو و لەبەر تەنگەبەریی جێکە بە سەر یەکدا کەوتبووین. هیچ شتێک جگە لە بۆنی تیژی تس، لە نێو ترێلیی تەراکتۆرە پرتەقاڵییەکەدا منی ئازار نەدەدا. بیست و چوار سەعاتەکە بۆنی تس دەهات.

- شەڕە تسێکی گەورەیە.

پێش لەوەی کاروانەکەمان بگاتە گوندی کیمار وەهام بە خاڵۆم گوت.

- نا. ئەوە گوویەکی گەورەیە و ئێمە هەموومان تێیچەقیوین.

خاڵۆم وەها وەڵامی دایەوە و داوای لە هەمووان کرد کە سوار بن. پاشا چوو لە شوێنی شۆفێرییەکە دانیشت. ئەمجارە من لە لای خاڵۆم دانەنیشتم و داوام لە ئالان کرد بچێ لە لای دانیشێ. ئەو لە خۆشیدا بڕوای

نەدەکرد. لەو کاتەوەی لە عەفرین دەرچووبووین بە هیوای ئەوە بوو. من لە ترێلییەکەدا مامەوە.

شەیدای بیستنی بەسەرهاتی هەردوو پیرێژنەکە بووم کە خۆیان بە بەتانیی ئەستووری تورکی پێچابووەوە. لە بەختی ڕەشم هیچ قسەیەکیان نەکرد. بەردەوام بێدەنگ بوون و سەیری زگی فریاڵیان دەکرد. هەر جارەوە یەکیان باوێشکی دەدا وەک ئەوەی ڕێکەوتنێکیان هەبێ. جارێک ئەم و جارێ ئەو. باوێشک دانیان بە درێژایی ڕێگە هیچ ڕانەوەستا.

لەو ساتەدا کە ڕووم وەرگەڕاند بۆ ئەوەی منیش باوێشک نەدەم، دایکم سیخورمەیەکی توندی ژەندە کەلەکەم. زگی فریاڵی پارێزەر سەرنجی ئەویشی ڕاکێشابوو. من خۆم لە دوای لاڵ بوونی دایکم بەو سیخورمە توندانە ڕاهاتبووم. لەگەڵ هەر تێوەژەندنێک پرسیاری شتێکی لێدەکردم.

- چیت دەوێ؟

منیش هەندێک بە توندی وەهام پێگوت.

دایکم دەستی لەسەر سینگی خۆی دانا و پاشان کەوانێکی کێشا کە کۆتاییەکەی گەیشتە بن ناوکی. پاشان سەیری پارێزەی ئاوسی کرد و بە قامکی خۆی ئیشارەی کرد کە من وا تێگەیشتم دەیهەوێ بزانێ زگی فریاڵ چەند مانگانە.

پارێزەی دووگیان سەرقاڵی خواردنی دەنکی سووری تۆخی هەنارێکی گەورە بوو کە پێدەچوو لەو باخە چنیبێتیەوە کە شەوێک لێی ماینەوە. دەنکە سوورە ئاودارەکانی بە هەوەسێکی سەیرەوە دەخوارد. من ماسوولکەکانی دەموچاویم دەدیت کە چۆن دەجووڵن. لە جووڵەکانەوە تێگەیشتم هەنارەکە چەند ترشە.

دواتر، دوای ئەوەی لە خاڵۆ عەلیم پرسی، تێگەیشتم هەندێک هەنار تا کۆتایی زستان بەسەر لقەکانەوە دەمێننەوە ئەگەر کەس نەیانچنێتەوە.

داواکەی دایکمم پێ سەیر بوو! جا چۆن من لەو ژنە بپرسم زگی چەند مانگانە؟ چ پرسیارێکی بێواتایە لە منداڵێکی چواردەساڵانەی وەک منەوە؟ هەوڵمدا ویستەکەی دایکم پشت گوێ بخەم، بەڵام ئەو سووربوو لەسەری. چەند جاران تێوەیژەندم تا سەرنجی فریاڵی پارێزەری ڕاکێشا. ئەو وایدەزانی دایکم دڵی چووەتە سەر هەنار، بۆیە پارچە هەنارێکی بەرەو دایکم ڕاداشت. دایکم نەیویست و ئاماژەی کەمێک لەوە بەری دووبارە کردەوە. پارێزەر پێکەنی. هەنارەکەی دانایە سەر بەتانیی ڕاخراو لە نێو ترێلیدا و پاشان هەردوو پەنجەی دەستی بەرەو ئێمە هێنا و قامکە گەورەی دەستی ڕاستی چەماندەوە.

- نۆ مانگانە.

ئەمەم بە گوێی دایکمدا چپاند.

زۆر دژوار نەبوو کە دایکم لە ئاماژەکەی فریالی پارێزەر تێبگا. دەستی گرتەوە و سەری بەرەو ئاسمان هەڵهێنا کە کاروانە هەور لێی باریان دەکرد، لە پڕ هەردوو دەستی هێنا بە ڕوخسارە زەرد و باریکەڵەکەیدا. بەمجۆرە دەیویست بڵێ کە دۆعای بۆ پارێزەر کردووە.

لەو ئانوساتەدا پارێزەر بە ئارامی دانیشت و هەنارەکەی هەڵگرت و دەستی بە خواردن کرد.

تەراکتۆر بە ڕێگایەکی زیکزاکی بە نێو گردی بەردیندا ڕۆیشت و پاشان هاتە خوارەوە بۆ ڕێگەیەکی ڕاست. قەرەباڵغی کەم ببوو. خاڵۆم خێرایی تەراکتۆری زیاد کرد. دوای چارەکێک گەیشتنیە خاڵێک لە نزیک گوندی کیمار. دیسان ڕێگا بە ئۆتۆمبیلێکی زۆری ڕیز لە دوای یەک بەسترا. لەپڕ فریال قیڕاندی و هەردوو پیرێژن دەوریان دا. بە ئێمەیان گوت کە دەبێ ئێمە واتا من و ئالان لە ترێلی دابەزین.

تێگەیشتم کە بابەتەکە پێوەندی بە زگی فریالی پارێزەوە هەیە. بە پەلە لە ترێلی دابەزیم و هاوکاریی براکەشمم کرد کە دابەزێ. دایکیشم بە پەلە کەوتە جووڵە و هاوکاریی پیرێژنەکانی کرد. کاتێک دیتی ئێمە سەیری ئەو دیمەنە سەیرە دەکەین، هات و دەرگای ترێلیی لە پشتەوە بەست و گەڕایەوە لای پیرێژنەکان و فریال کە بەردەوام دەقیڕاند.

- چ بوو؟

خاڵۆم پرسیاری کرد.

منیش باسی فریاڵی پارێزەری دووگیان و قیڕە و قیژەکانیم کرد کەلەگەڵ گەیشتنە ئەو خاڵە دەستی پێکردبوو. ڕوخساری خاڵۆم ترش بوو، لێوی خۆی گەست و گوتی:

- یانی منداڵەکەی دەبێ؟ وەی باوکە گیان هەر لەمەمان کەم بوو.

- بەڕاست؟

من مەعسوومانە پرسیم، بەڵام ئەو بە توورەییەوە وەلامی دایەوە:

- ئەرێ ڕاستە جاشەکەر. زۆریش ڕاستە. خەڵک تەنانەت لە ژێر بومبارانیشدا تەپ ئەدەنە سەر یەک. پەڕیـن لەیەک لە نێو مرۆڤدا قەت ڕاناوەستێ. بۆ چرکەیەکیش ڕاناوەستێ. تۆ دەزانی تێکوتانی ژن و مێرد تا هەتایە بەردەوامە؟

- تۆ چۆن ئەمە دەزانی خاڵۆ؟

- بە ئامارەکاندا هەی جاشەکەری خاڵۆ. دەڵێن هەر چرکەیەک سێ منداڵ لەدایک دەبێ. واتا هەر چرکەیەک سێ کۆرپەڵە لە ماڵزارۆکدا بەجێ دەکرێ. جا ئەگەر تێنانی بێئەنجام یان و یان لەبەرچاو نەگری. تێنان قەت

ڕاناوەستێ. نە شەڕ، نە کارەسات و نە هیچ شتێکی دیکەش ناتوانێ ویستی مرۆڤ بۆ تێکوتان و تێنان ڕاوەستێنێ.

- دەی باشە بڵێ چ بکەین کە لەدایک بوو؟
- دەرەخسین و سەما دەکەین ورچەکەی خاڵۆی. جا چ بکەین؟ دیارە ئێمە ناتوانین هیچ شتێک بکەین. هیچ شتێک، دیسان بەرەو حەڵەب دەچین وەک ئەوەی هیچ نەبووبێ. هەرچۆن شەڕ و کارەساتی شەڕ نەیانتوانی ئەو ژنە و مێردەکەی لە منداڵ دروستکردن پاشگەز بکەنەوە، هەر بەوچەشنەش لە دایکبوونی منداڵێک ڕێگە لە ئێمە و کۆچبەرییەکەمان ناگرێ.

ژنە هەر دەیقیڕاند. ئێمەش دەنگەدەنگی هەردوو پیرێژنەکەمان دەبیست کە پێیاندەگوت فشار بۆ خۆی بێنێ و زیاتر خۆی بگووشێ بۆ ئەوەی مناڵەکە بە ئاسانی بێتە دەرەوە. ئالانی برام سەیری منی کرد و پێکەنی. دەیویست ئەوەندەی دەتوانێ پێکەنینەکەی بشارێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی.

- ئەوە چییە؟

لەپڕ خاڵۆم سەیری منی کرد و قیڕاندی.

- چ بووە؟

من به ترسەوە لێمپرسی. هێشتا چاوی لەمن بوو گوتی:

- ئەستۆت کامۆ، ئەستۆت! وەک کۆتەی دارێکی پیر دیارە. ئەوە چییە؟

من دەستم برد بۆ ئەستۆم و دیتم زۆر زبر بووە. پاشان ئاسەواری سپیبوونم بە سەرپەنجەمەوە دیت.

- دەترسم ببمە ماسی.

دوای ئەوەی زانیم پێستم وەک پوولەکەی ماسیی لێهاتووە بە پێکەنینەوە وەڵامی خاڵۆم دایەوە. خاڵۆم بە جیددی وەڵامی دامەوە.

- خۆ من گاڵتە ناکەم کامۆ. ئادەی با سەیری کەم. ئەی خودااااا. پێستت وشک بوو، ترەکیوە و سپی بووەتەوە. دەترسم نەخۆشیی سەدەفت گرتبێ. من دکتور نیم، بەڵام ئەمەش ئاسایی نییە. لە حەڵەب دەتبەم بۆ لای دکتورێکی پسپۆڕی پێست.

ناڵینێکی درێژ لە فریاڵەوە قسەکانمانی لەنیوەدا هێشتەوە. ئالانی برام ڕاچڵەکی و خۆی خستە ژێر دارێک. ئاسمان ساماڵ بوو و شنەبایەک دەهات. دەنگەدەنگی کۆچبەرانی دانیشتووی نێو پیکاپ و ترێلیی تەراکتۆرەکان نەدەبڕا. لاقی ئەو کۆچبەرانەی لە هەردوو قەراخی جادە بە نێو قوڕوچڵپاودا دەڕۆیشتن، شوێنی خۆی جێدەهێشت. بارانە بەهارییەکەی دوێنێ

زەویی تەڕ و قوڕ کردبوو. هەموو ڕوخسار ترش بوو و دۆڕانیان لێ دەتکا. هەموو چاوەکان لە بریی فرمێسک، ترسیان دەباراند. لێوی هەمووان وشەی نادیاریان بەلێو دەکرد. تەنیا ناڵە و هاواری فریالی پارێزەر ڕوون و ئاشکرا بوو. دایکێک لە ترێلیی تەراکتۆرێکدا منداڵێکی دەبێ. لە ڕێگەی هەڵاتندا، هەڵاتن لە بۆمبارانی لقی زەیتوون، دایکێک لە قەراخی ڕێگەدا دەزێ.

یەک لە پیرێژنەکان لە پاڵ ترێلیدا ڕاوەستا و بانگی کرد:

- بڵێی بتوانن ئاوێکی گەرم بێنن؟

خالۆم پێکەنی و بە دەنگێکی نزم کە نەدەگەیشتە پیرێژن، وەڵامی دایەوە:

- ناتەوێ بشتدەین بە شوو؟

پاشان سەیری منی کرد و بە تووڕەییەوە گوتی:

- ئەم شێتە وادەزانێ ئێمە لە هوتێلێکی پێنج ئەستێرەداین.

لەو کاتەدا ماڵباتی خالۆ نەعسۆ لە تەراکتۆر دابەزین دوو کوڕی حەوت و هەشت ساڵان بوون. دایکیشیان وەک دیاربوو لە ترێلیدا مایەوە بۆ ئەوەی هاوکاریی پیرێژنەکان بکا.

من ڕووم کردە یەکیان:

- ناوت چییە؟

- حەننان.

بەدەم باوێشکەوە وەڵامی دایەوە. لەوی دیکەیانم پرسی: ئەی تۆ؟

- مەننان.

لە کەمخەویدا چاوی هەڵگلۆفی و وەڵامی دایەوە. خاڵۆم بە گاڵتەوە گوتی:

- تۆ چەند ڕۆژ لە ماڵی خاڵۆ نەعسۆی باوکیان مایتەوە و هێشتا ناویان نازانی هەی جاشوولکەی خاڵۆی!

- یەکیان حەننانە و ئەویدی مەننان، کێشە لە ناوەکانیاندایە نەک لە هۆشی مندا ئەی خاڵۆی جاشوولکەی خۆت.

خاڵۆم بە دوا قسەکەم پێکەنی، زۆر پێکەنی و بەرەو دار زەیتوونێک چوو، لە سێبەرەکەیدا دانیشت و بەشێک لە گۆرانییەکی عەلی تجۆی کە ناوی "یارا ملیسا" بوو وتەوە.

گەلێک لاو لە دەوری کۆ بوونەوە. بێدەنگ گوێیان لەو گۆرانییە خەمگینە گرت. دیتم کە چۆن پیاوی گەورە بە گۆشەی مێزەرەکەیان، فرمێسکەکانیان دەسڕنەوە. پاشان دیتم کە چۆن ڕوو دەکەنە شوێنی دی وەک ئەوەی بیانەوێ فرمێسکەکانیان لە چاوی کەسانی دی بشارنەوە.

***

ژنەکەی خاڵۆ نەعسۆ لەناکاو هاتە ناوەڕاستی تریلی و لیلاندی.

- چ بووە؟

خاڵۆم وازی لە تەمبوورژەندن هێنا و ڕووی کردە ژنەکەی خاڵۆ نەعسۆ.

- ژنەکە بە سلامەتی بارەکەی دانا.
- شوکر بۆ خودا.

ئەو وەڵامی دایەوە و تەمبوورەکەی خستە سەر شانی.

- بەڵام ئەو هەژارە کچی بووە.
- ئەوە کێشە نییە. کێشەی سەرەکی، سلامەتیی ژنەکەیە.

خاڵۆم ئەم وەڵامەی دایەوە و چووە سەر جێی شۆفێر دانیشت.

- مەگەر ناتەوێ تەمبوور بژەنی خاڵۆ؟
- هەر ئێستا فریاڵ شیرینترین ئاهەنگی ژەند. ئەو کچێکی بوو، لە کچ شیرینتر هەر نییە. ڕاستە کە من ژنم نەهێناوە، بەڵام دایکم هەمیشە دەیویست کچێکی دیکەی ببێت، ئەمە ببووە خەونی منیش.

مەیسۆم بیر کەوتەوە. مەیسۆی خوشکم کە بومبا کردییە دوو پارچە لە ساڵڕۆژی لەدایکبوونیدا.

سەرم بەردایەوە بەرخۆم و بیرم کردەوە. دایکە لاڵ و خەمگینەکەی خۆمم بیر کەتەوە. تاقە کچی دایک و باوکی خۆی. لەیلای دایکم، بێوەژنی خەمگین و کچی نازلییەی داپیرەم کە لە نەخۆشخانەیەکی حەڵەب لە ئەنجامی بومبارانی فڕۆکەکاندا لە ژێر داروپەردووی وێرانەکاندا مرد.

نزیکەی سەعاتێک لەوێ ماینەوە. لەپڕ دیتم هەردوو پیرێژن لە ترێلی دابەزین و چوون لەبەر ڕەگی دارێک، شتێکی پێچراو لە قوماشێکیان خستە ژێر عەرز. ویستم بزانم چییە، لە خاڵۆمم پرسی، ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی:

- ئەوە کاری ژنانە. لێیگەڕێ. لەوانەیە پیرێژنەکان، هەڤاڵبچووکەکەیان (لف) شاردبێتەوە.
- هەڤاڵبچووک؟
- ئەرێ هەڤاڵبچووک.
- کەنگێ هەڤاڵی بچووک شەهید بووە؟
- هەڤاڵبچووک هەی جاشوولکەکەی خاڵۆ نەک هەڤاڵی بچووک. ئەویش پارچەیەکە لەگەڵ کۆرپەی نوێ لەدایکبوو، دێتە دەر. وەک منداڵ دەیشارنەوە کە پشیلە و مشیلە نەیخۆن.
- ئەگەر بیخۆن چ دەبێ؟
- ئینجا کۆرپەی تازە لەدایکبوو وەک تۆ فرەوێژ دەبێ.

هەروا ڕۆیشتین تا گەیشتینە نزیک تەراکتۆر. دەنگی ژنانی دەوری فرپیاڵ دەگەیشتە ئێمە:

- ناوی کچەکە بنێ کیمار. چونکە لە نزیک کیمار لە دایک بووە.
- نا. ناوی بکەنە گوڵنار. چون دایکی دواجار هەنارێکی خۆش لە هەنارەکانی باسووتی دەخوارد.
- ئەی بۆ نەیکاتە عەفرین؟ عەفرین لە هەمووی باشترە. تووشی کارەساتێکی مەزن بووە. ئەم کچە و دایکیش هەر وا.

هەڵبەت دایکم نەیدەتوانی هیچ ناوێک پێشنیار بکا. بەڵام لە نێو قەرەباڵغیی ئەو ژنانەدا دەنگی لاوازی فریاڵ هات کە هەموو ناوەکانی ڕەت کردەوە و گوتی:

- ناوی دەنێم قافڵە[٣]. ئەری قافڵە. هیوادارم قافڵەکەمان بگاتە شوێنێکی هێمن و ئارام.

---

[٣] کاروان

# لەژێر چادری سپیدا

دوای لە دایکبوونی قافڵە هەموو شت وەک خۆی ما و دۆخەکە هیچ نەگۆڕدرا. ئێمە هەر لە ژێر سێبەری دار زەیتوونێکی پیردا ماینەوە و چاوەڕێ بووین کاروانی ئۆتۆمبیلەکان جارێکی دی بکەوێتە ڕێ.

دوای دوو ڕۆژی سەخت و دژوار لە تەراکتۆردا لە نزیک کیمار، بە نێو کوریدۆری ئارامدا درێژەمان بە کۆچبەریی بەرەو حەڵەب دا. دەنگۆیەک بڵاو بووەوە کە خاڵی پشکنینی ئەلزیار کە پێیدا دەچیتە حەڵەب، کراوەتەوە. ئیدی کاروانی بێکۆتایی کەوتە ڕێ و ڕووی کردە ئەو خاڵەی کە فڕۆکەکانی تورکیا مانگێک پێش بومبارانیان کردبوو بۆ ئەوەی یارمەتییەکانی سوپای سووریا نەگاتە دەستی شەڕڤانان لە عەفرین. کاتێک بیستم بەرەو ئەوێ دەچین، ترسام. ئێمە لە ژنان و منداڵانمان بیستبوو چ کارەساتێک هات بەسەر خەڵکی مەدەنیدا لە ئەنجامی بومبارانی فڕۆکە شەڕکەرەکانی تورکیا.

لە کیمارەوە ئیدی ڕێگە سەخت و دژوار دەبوو. بە پێچەوانەی ڕێگە لە عەفرینەوە تا گوندی عەین دارا. چەندە لە عەفرین دوور دەکەوتینەوە دژواری و زەحمەتی زیاتر دەبوو، ترس زیاتر دەبوو، سەرسوورمان زیاتر دەبوو و قاقڕیی ڕێگە و خاڵی پشکنینیش زیاتر دەبوو.

- دەبێ نەخشەڕێیەک هەبێ کە ئێمە لەم جوغرافیا نەفرەتییەدا بتوانین بگەڕێین. لە هەر جێیەک خاڵێکی پشکنین هەیە کەس نازانێ هی کێیە! لە هەر خاڵێکیش دەبێ مرۆڤ کوڵێک پارە بدا کە دەرباز بێ.

لە حەسانەوەی نێوان دوو خاڵدا خالۆم بە تووڕەییەوە شەقێکی لە تایە گەورەکەی تەراکتۆرەکە هەڵدا و ئەمەی گوت.

خەڵک لە هەموو شت زیاتر لە خاڵی پشکنین دەترسان. ئەو لاوانەی کە سەربازییان نەکردبوو لە هەمووان زیاتر دەترسان. لایەنەکانی شەڕ، هەموو پێویستیان بە لاوەکان بوو و لە خاڵەکانی پشکنیندا دەیانگرتن و دەیاننارنە جەبهەی شەڕ. لە هەموو خاڵەکان خەڵک تووشی سووکایەتیی بەئەنقەست دەهاتن. بە سەعاتان چاوەڕوان دەمان، برسی دەبوون، تینوو دەبوون، چوونە ئاودەست بۆیان دەبووە خەون.

ئێمە بە ترسەوە دەڕۆیشتین تا گەیشتینە شوێنێک هەڤاڵانی پارتی هاتنە پێشمان. ئەوان پێیانگوتین چوون بۆ حەڵەب نامومکینە و ڕژیم ڕێگەی بەستووە و ناهێڵێ کەس بچێتە پێش و لاوان دەگرێ و دەیاننێرێتە جەبهەی شەڕ. ترسی ئێمە زیاتر بوو. دەی ئەمجار ڕوو لە کوێ بکەین؟ خاڵۆم بە توورەییەوە گوتی:

- نەفرەت لەم حاڵە، ئەی ئەم توونێلە ڕەشە کۆتایی نایە؟
- کێشە نییە هەڤالان. ئێمە دەتانبەینە کەمپی بەرخۆدان.

شەڕڤانێکی سمێڵئەستووری تەمەن نزیکەی چل ساڵان هاتە پێشەوە و ئەمەی گوت.

پێش لەوەی دەربازی نێو کەمپ ببین، تەراکتۆرەکەمان جێ هێشت. ئێمە، من و دایکم و ئالان و ماڵباتی خاڵۆ نەعسۆ، دوو پیرێژنەکە، فریاڵی پارێزەر و کۆرپەکەی، لە ترێلی دابەزین و دەربازی نێو کەمپ بووین.

***

لە کەمپی بەرخۆدان، خەڵک سەریان لێشوابوو. ئەوان وا دیاربوون، وەک ئەوەی لە قەبر هەستابێتنەوە و مەلایکە لێیانبخوڕن بۆ مەیدانی حەشر. دەیان هەزار کەس لە عەفرین و گوند و ناحیەکانەوە لە ترسی ئەرتەشی تورک و چەتەکانی هاوڕێی هەلاتبوون.

بومبـــارانی فڕۆکەکـــان و پاشـــان تـــاڵانکردنی گونـــد و شـــارەکان، هەرێمـــی عەفرینـــی کردبـــووە دۆزەخێـک کە جنن و شەیتانیش نەیاندەتوانی تێیدا بحەونەوە.

هەموو ئەمانە سەیر نەبوو.

شتی سەیر ئەوە بوو کە لە کەمپی پڕ لە گووی سپی، یانی خێوەتی سپی بە دەرگای شینەوە، دەنگی بڵێندگۆ بەردەوام هەبـوو. بەردەوام دووبارەیـان دەکـردەوە و دەیـانگوت؛ ئەوەی بـڕوا لە سـێبەری ئەردۆغانـدا بـژی خـایینە، ئەوەی بگەڕێـتەوە کە لە ژێـر سـێبەری ئـاڵای ئەرتەشی تورکی داگیرکەردا بژی خایینە، خایینە خایینە. ئـێمە نـاگەڕێینەوە عەفـرین تـا ڕزگـار نەبـێ. ئـێمە بە سەربەرزی و سەرکەوتوویی دەگەڕێینەوە، بەڵێنتان پێ دەدەیـن. خـۆڕاگری و تەحەمـوڵکردنی ژیـانی دژواری کەمپیش بۆ خۆی چەشنێک خۆڕاگرییە. ئێمە بە سەبر و ئارامییەکەمـان لە بەرانـبەر گـورگی ئانـادۆڵ خـۆڕاگریی دەکەین. ژیانی ژێر خێوەت باشترە لە ژیانی ژێر ئـاڵای داگیرکەران. بەر لە هەموو شت کەرامەت.

مـن خـۆم لەو قسـانە تێنـاگەم. تەنـانەت تـا ئێسـتاش تێنەگەیشـتووم بـۆچی ئەم کارەسـاتە بە سـەر مـن و خێزانە بچووکەکەمدا هات؟

کاتێک خاڵۆم بانگەوازی سەر بڵێندگۆی بیست، گوتی:

- ئەم سەرلێشـێواوانە دەیـانەوێ ئـێمەش لەگەڵ خۆیان سەرلێشێواو بکەن.

بەڵام ئەویش نەیتوانی ئەم ناکۆکی و دژوازییە شرۆڤە بکا. جارێک هەڤاڵان فەرمانیان دەدا گوندەکان چۆڵ بکەن و خۆتان ئامادەی کۆچبەری بکەن. جاریکیش هەوڵیان دەدا ڕێگە لە کۆچبەریی بگرن. هەندێکیش کە لە گوندەکان دەرچووبوون بە زۆر گەڕێنرانەوە نێو گوندەکانیان. بەڵام ئەمجارە لە کەمپ ڕایانگەیاند کە هەرکەس بگەڕێتەوە عەفرین خاینە و هاوکاریی تورکی داگیرکەر دەکا.

جارێک ژنێکی پیر لە گوندی بریمجە لەبەر دەرگای خێوەتەکەی دانیشتبوو، گۆپالەکەی خۆی هەڵهێنا و ڕووی کردە ئاسمان و گوتی:

- پشکنینی ڕژێم ناهێڵێ کەس بچێتە حەڵەب، هەڤاڵیش هەر وەها. دیارە پشکنینی دز و چەتەکانیش ڕێگەی گەڕانەوە بۆ عەفرینیان گرتووە. ئەمانە چۆن ئاوا هەموو لێکیانکردووە کە خەڵکی عەفرین لە چۆڵ و بیابان بن، شار و ماڵەکەشیان تالان و داگیر بکرێ؟ خودا خودا گشتی بۆ ئێمە بوونەتە یەک، ئەی تۆش؟

پیرەمێردێکی هاوتەمنی خۆی بەرەو ڕووی هات و لە لای دانیشت، سڵاوی لێکرد و گوتی:

- سەریان لێشێواندین و سەرلێشێواوتریشمان دەکەن. سەرەتا گوتیان دەرچن و بچنە دواوە، خەڵکیان ناچار کرد بمێننەوە، ئێستاش دەڵێن

کێ بگەڕێتەوە خاپینە. دە وەرە قسەی ڕاست دەرخە.

- ئەرێ وەڵڵا. ئەوانە سەریان لێشێواوە. کارەساتێکی گەورەیە و ئەوانیش خۆیان ئامادە نەکردبوو بۆی.

من بۆ خۆم لە نزیکی ئەوان ڕاوەستابووم و گوێم لە قسەکانیان گرتبوو. چەند دەقەی پێنەچوو پیاوێک بە لاقێک و دوو گۆپاڵەوە هات و چووە لایان دانیشت. لاقە ساخەکەی ڕاکێشا و گوتی:

- ئاخ ئەگەر من هەر دوو لاقم ساخ با. وەڵاهیی لە عەفرین دەرنەدەچووم تەنانەت ئەگەر شەهید کرابام.

- حەح، خۆ گەلێک کەسی لاقداریش هەبوو، بەرپرس بوون، هەر کە دەنگی فڕۆکەیان بیست، لاقی دیکەشیان لێ شین بوو و پێش هەموو کەس هەڵهاتن. زۆر تاریفی خۆت مەدەوە.

پیرێژنەکە وەڵامی دایەوە و بووە تریقەی پێکەنینی هەرسێکیان.

***

هەرسێکیانم لەگەڵ تریقەی پێکەنینەکانیان جێهێشت و ڕۆیشتم تا دوو خێوەتی دیکەم تێپەڕاند و گەیشتمە نزیک سێهەمەکەیان. پیاوێک سەرنجی منی ڕاکێشا. لەبەر دەرگای شینی خێوەتێک دانیشتبوو و بەتانییەکی

له خۆوه پێچابوو. لەبەر شەوقی خۆر چاوی دەبەست و بەردەوام قسەی دەکرد. کەمێک له نزیکی ڕاوەستام. وامدەزانی لەگەڵ خۆی قسه دەکا. لەو کەمپه گەلێک ژن و پیاوم دی لەگەڵ خۆیان قسەیان دەکرد. له ڕێگای کۆچبەرییشدا گەلێک کەسی وەهام دی.

له نزیکی ڕاوەستام و گوێم لێگرت:

- ئەوان دەیانویست من بکەنه قەڵغانی زیندوو. لەبریی ئەوەی بمانپارێزن، دەیانویست خۆیان به ئێمه بپارێزن.

کەمێک بێدەنگ ما و دیسان گوتی:

- نەسرین مەگەر بیرت نایەتەوه کاتێک دۆخەکه تێکچوو و خەڵک به هەزاران هەڵهاتن و ئێمەش له ناویاندا بووین؟

تێگەیشتم که لەگەڵ ژنێک قسه دەکا، لەوانەیه ژنی خۆی بێ له ناوەوەی خێوەتەکه.

- چۆن بیرت ناکەوێتەوه هەی مریشک؟ هێشتا دوو حەفتەی بەسەردا تێنەپەڕیوه.

له ناوەوەی خێوەت همەهمێکی نادیار هات. بێگومان ژنەکەی بوو وەڵامی دەدایەوه و له ناونیتکەی مریشک دڵگران ببوو.

- ئەرێ بەڵام تۆ مریشکی. تەنیا ئەوەی دەتەوێ بیرت دەکەوێتەوه. ڕەنگی کراسی دراوسێکەت له بووکێنیی فلان کەسدا که ده ساڵ پێش بووه،

دێتەوە یاد. ئەو تاقمە فنجانە قاوەی فلانەکەس پێنج ساڵ پێش ئێستا بە دیاری دابووی بە فیسارەکەست، دێتەوە یاد، کەچی ڕووداوەکانی دوو حەفتە پێشت نایەتەوە یاد. بەهەر حاڵ کاتێک ئێمە چەند کیلۆمەتر لە عەفرین دوور کەوتینەوە، چەکدارەکانی پارتی هاتنە سەر ڕێمان. لە ناوەڕاستی ڕێگە بەردیان دانا کە ئێمە کۆچبەر نەبین. مەگەر تۆش یەک لەو ژنانە نەبووی کە دانەویت و بەردت لابرد و درێژەمان بە ڕێگەکەمان دا؟

ئینجا دەنگی ژنە لە ناو خێوەتەوە هات بە بێزارییەوە گوتی:

- بیرم کەوتەوە. کێشەکە لەوە گەورەتر بوو کە چەند لاوی چەکدار لە بەرانبەر ئەو تۆفانەدا ڕابوەستن.

هەردووکیانم بە بۆڵەبۆڵەکەیانەوە جێ هێشت و ڕۆیشتم تا گەیشتمە بەر دەرگای خێوەتی ژنێکی هەژار. ئەو ڕۆژێک دوای ئەوەی گەیشتبووە کەمپەکە، سووتابوو. ویستبووی خواردنێکی گەرم بۆ منداڵەکانی ئامادە بکات. ئەو و منداڵەکانی سێ ڕۆژ بوو لە ڕێدا بوون و هیچیان نەخواردبوو. لەگەڵ داییسانی بۆتانگازەکە ئاگر بەربووەوە خێوەت و جل و نوێنەکانی نێو خێوەت و ژنەکەش سووتابوو. نەمرد،

بەڵام ئیدی لە جووڵە کەوتبوو و دەست و پێی فەلج ببوو. خێرا لەو خێوەتە سووتاوە دوور کەوتمەوە و ڕووم کردە یەکی دی.

گەلێک لەو خێوەتانە بەپەلە هەڵدرابوون، بێدەنگ بوون. یانی کەسانی نێوی بێدەنگ بوون. بە پێش هەر خێوەتێکدا ڕادەبرام، وەک ئەوە وابوو بە پێش گۆڕێکدا ڕاببرم. بەڵام هەندێک خێوەتیش هەبوو کە دەنگی تێدا بوو. دەنگی منداڵ کە یارییان دەکرد، دەنگی ژنان کە لەیەک کۆ ببوونەوە و دەنگی پیاو کە خەریکی قسە و باس بوون. گەلێک چیرۆکی سەیر و سەمەرەم دەربارەی کۆچبەریی بیست. خۆشحاڵ بووم کە ئێمە بە تەراکتۆر هەڵهاتبووین و زۆر هەستمان بە ڕێگەکە نەکردبوو. زۆر کەس بە پێ لە عەفرینەوە تا کەمپەکە هاتبوون و لاقیان پێوە نەمابوو. لە نێو دار و بەرد و لە پشتی دیوار و لە نێو باخە زەیتوون و تەنانەت ئەشکەوتیشدا شەویان بردبووە سەر.

***

ئەو ڕۆژە کاتێک هێشتا بەرەو پێش دەچووم لە پێش دەرگای خێوەتێکی کەمێک دوورتر، کۆمەڵێک پیاوم بینی، لە سەر کورسی دانیشتبووین و ڕوخساری ماندوویان دابووە بەر خۆری بەتین. دووکەڵی جگەرە وەک پارچەیەک مژ، کەوتبووە لای سەروویان. من لە

ڕۆیشتن بە نێو خێوەتەکاندا ماندوو ببووم و حەزم لە حەسانەوەیەکی کورت بوو. ڕووم لە خێوەتی ئەو پیاوانە کرد کە کەمێک لایان بم و گوێ لە قسەکانیان بگرم. لە نزیکیان دانیشتم ئەوەندەی کە دەمتوانی دەنگی هەناسە و لێویشیان کە دووکەڵی سپیی بەردەدایەوە نێو بۆشایی ئاسمان، ببیستم.

هەر کامەیان بەسەرهاتی کۆچبەرییەکەی خۆی دەگێڕایەوە. هەموو بەسەرهاتەکان وەک یەک بوون، نەک هەر ئەوە بەڵکوو هەر هەمووی یەک بەسەرهات بوون و بە ژمارەی پیاوەکان دووبارە دەبوونەوە. بەڵام یەکیان زۆر جیاواز بوو. خاوەنی بەسەرهاتی ئازاراوی، چیرۆکەکەی خۆی کە لە هی کەسی دی نەدەچوو گێڕایەوە. هەمووان باسی خۆیان و کۆچبەرییان لە عەفرین و گوندەکانەوە دەکرد، تەنیا ئەو باسی هەوڵدان بۆ گەڕانەوە بۆ عەفرینی دەکرد:

"سەرەتا بڕیارم دا کۆچبەرییەکەم تا حەڵەب درێژ بکەمەوە و خۆم بگەیەنمە لای منداڵەکانم لە گەڕەکی ئەشرەفییە. دانیشتووانی شیعەی شارۆچکەی نوببل بە دڵفراوانییەوە پێشوازییان لێکردین. بەڵام ژمارەی ئێمە ئێجگار زۆر بوو، نە لە مزگەوتدا، نە لە دەبستاندا جێمان نەدەبووەوە. گەلێک کۆچبەر چوونە نێو کۆڵان و کەناری شەقامەکان و هەر لەوێ نووستن. هەندێک کەسی دڵڕەش هەبوون، پێش ماڵەکەی خۆیان بە کرێ

دەدایە کۆچبەرە هەژارەکان. پارەیەکی خەیاڵیشیان لێ دەستاندن. تەنانەت میزکردنی خەڵکەکەش! میزکردنیش بە پارە بوو. وەلاهیلعەزیم هیچی لێ زیاد ناکەم. میزکردنی نرخێکی هەبوو، گووکردنیش لەو گرانتر بوو، ئینجا ئاو و خواردنیش لە لایەک دانێ.

با لێیگەڕێین. بیستم هەندێک قاچاخچی هەن لە قاوەخانەی شار کۆ دەبنەوە و موعامەلە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەن کە دەیانەوێ بچنە حەلەب. من هیچ پارەیەکم پێنەبوو. هەر ناشزانم چۆناوچۆن لەگەڕەکەکەمان هەڵهاتم! وەک شێتم لێهاتبوو، کۆلانەوکۆلان دەگەڕام تا ئەوەی دیتم لە باسووت لەپێش پیکاپێکدام کە بەرەو عەین دارا دەچێ. لە کۆتاییدا هەوڵم دا هەندێک پارە لە کەسانی ناسیاوی خۆم قەرز بکەم، بەلام کەسم دەست نەکەوت.

چوومە لای قاچاخچییەک و پێمگوت هەموو منداڵەکانم لە حەلەبن، بەکەرەمی خۆتان من بگەیەننە ئەوێ، لەوێ منداڵەکانم چیتان بوێ، دەتاندەنێ، کوڕە گەورەکەم دوکتورە و لەویش بچووکتر دەرمانفرۆشێکی ناسراوە، بێگومان دووقاتیش پارەکەت دەدەن.

بەلام کابرای قاچاخچی بە من و قسەکانم پێکەنی و گوتی: "جا حاجی کەسێک ماسی لە ئاودا دەکڕێ؟ ئەگەر دەتەوێ بچیتە حەلەب دەبێ سەرەتا پارە بدەی.

ئێمە خۆشمان پارە دەدەینە خاڵەکانی پشکنین. بێ پارە کەس دەرباز نابێ با ئیمام حسەینیش بێ. من تەنیا دەتوانم هەندێک کرێی کەمترت لێوەربگرم. هاوڕێکانم نەفەر بە ٦٠٠ دۆلار دەبەن، تـــۆ ٥٠٠ دۆلار بـــدە بـــا بتگەیەنمە ئەشرەفییە. دە توخوا گوێ لەو کەرە بگرن! پێیوابـــوو مـــن مریشـــکم و هێلکەکانیشـــم دۆلارن. ئەو نەیدەزانی مـن بـە هـۆی پاریزەوە لە ترسـان ناوێرم گووش بکەم".

هێندەی نەمابوو پێکەنینەکەم وەک گرکان بتەقێتەوە. لەو ناوبەرەدا تریقەتریقی کەسانی دانیشتووم بیست. ئەو پیـــاوەی بەسەرهاتەکەشـــی دەگێـــڕایەوە پێکەنـــی. جگەرەیەکی بەو جگەرەی هێندەی نەمابوو بکوژێتەوە داگیرساند و گوتی: "برادەرینە شتی گرنگ ئەوە بوو کە هەمـــوو هەوڵەکـــانم بـــادیهەوا بـــوون. هـــیچ کەس تاقەقرووشێکی بە قەرز نەدامێ. قاچاخچی لە هەر کوێ بن بەندە و کۆیلەی پارەن و بە لیرە دەڵێن دایکە. جا من ئەمجار چی بکەم؟ گەلۆ لە نوببل بمێنمەوە؟ نابێ. ئەوێش بەشی خۆی پارەی دەویست. هەر کە ژمارەی کـــۆچبەران زیـــاتر دەبـــوو، نرخـــی حەوانەوە و نیشتەجێبوونیش زیاتر دەبوو. من بیرم لە گەڕانەوە کردەوە. بە خۆمم گوت دەبێ بگەڕێمەوە. بە پێیش بێ هەر دەگەڕێمەوە. بە سکەخشکێش بێ هەر دەگەڕێمەوە

تا بگەمەوە ماڵی خۆم و تێیدا ببمە سوڵتان. بە چۆکیش بێ دەگەڕێمەوە عەفرینە جوانەکەم".

لەبەر شەوقی خۆر دوو فرمێسکی ڕوونم دی کە بە ڕوخساریدا هاتنە خوار. هێشتا نەمدیبوو پیاو بگرین. زۆر بۆی خەمگین بووم. دڵم گوشرا. ویستم لە جێی خۆم هەڵستم و بڕۆم، بەڵام مەراقی بیستنی تەواو بەسەرهاتەکەی منی بە جێکەمەوە بەستەوە. ڕوخساری خۆم خستە نێو هەردوو دەستم، هەروەک ئەوەی دایکم هەمیشە وای دەکرد، و بە سەرنجەوە گوێم هەڵخست بۆ چیرۆکەکەی:

"بڵێی عەفرینیش وەک فەلەستینی لێ بێ؟ بڵێی ئێمەش بۆ باخە زەیتوونەکان بگرین هەر وەک چۆن فەلەستینییەکان تا ئێستاش بۆ باخە لیمۆ و پرتەقاڵەکانیان دەگرین؟ دەڵێن چەکدارەکانی ئەلخووتای خێزانەکانیان دێنن و دەست دەگرن بە سەر ماڵ و باخ و بێستانی ئێمەدا. دەشڵێن ئۆتۆبووسی سەوز لە ئەلخووتای دێنە دەر و ڕوو لە عەفرین و جەرابلوس دەکەن. بازاڕە بازاڕ. ڕووسەکان عەفرینیان فرۆشتە تورکان و تورکانیش ئەلخووتایان فرۆشتە ڕووسەکان و ڕژێم. وەلاهی بازاڕێکی وەها لە قاوەخانەکەی نوببلیش نەبوو. هەی هاوار خەڵکینە مەگەر ئێمە چووین ئەلخووتامان وێران کرد و دانیشتوانەکەیمان برسی کرد؟ جا ئەمە عەدالەتە؟ بۆچی ناهێڵن من بچمە حەڵەب

بۆ لای منداڵەکانم و لەم کەمپەدا ئەسیریان کردووم؟ باخەکەم لە دەست چوو. شوێنی زەیتگرتنەکەم تالآن کرا، بێگومان ئێستا ماڵەکەشم بووەتە ماڵی غەریبەکان. جا خوا ئەمە هەڵدەگرێ؟"

پیاوەکە سەری بەرەو ئاسمان کە ئیدی هەورەکان تێیدا بڵاو دەبوونەوە، هەڵێنا و بە دەنگێکی خەمگین گوتی:

"ئیدی گەڕانەوە بۆ عەفرین بووەتە خەون. جا توخوا سەیری ئەم چیرۆکە بکەن. من بەڕێگای سۆخانەکدا ڕۆیشتم و گەیشتمە ئەو خاڵی پشکنینەی بە دەست سوپای ڕژێمەوەیە. ئەوان داوای پارەیەکی زۆریان لێکردم. لە قاچاخچییەکانی نوببلیش زیاتر. یانی گەڕانەوە بۆ عەفرین لە ڕۆیشتن بۆ حەڵەب دژوارتر بوو. من نەمتوانی ئەو برە پارەیە بدەم کە نەگەڕێمەوە. جاخۆ ئەگەر لەوانیش ڕزگار بووبام، ئینجا خاڵی پشکنینی چەتەکان دەهاتە سەر ڕێم. دەڵێن لە خاڵی پشکنینی توروندە و کیمار چەتەکان ناهێڵن هیچ کەس شتومەکی خۆی دەرباز بکات. دەبێ هەموو شت بدەیتە ئەوان و بە پێیان بەردەوام بی لە ڕۆیشتن تا بگەیتە عەفرین".

هەر کە پیاوەکە وشەی عەفرینی هێنایە زمان، گەشکە گرتی و بەلای چەپدا نووشتایەوە، ئەوانەی لە لای

بوون دەوریان دا و شتێکیان بە من گوت کە تەنیا لە وشەی ئامبولانس تێگەیشتم.

ئەو پیاوەم نەدەناسی کە بەسەرهاتە خەمگینەکەی دەگێڕایەوە. ئێوارەکەی بیستم لە نەخۆشخانە بە هۆی جەڵتەی دڵەوە (کوتوپڕ) کە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی لێیدا، ڕۆح لە بەدەنی دەرچووە.

***

ئەو ڕۆژە لە پارچە تەبەشیرە زەردەکەم گەڕام، بەڵام نەمدۆزییەوە. هەموو ئەو شوێنانە گەڕام کە پێشتر چووبووم، بەڵام هەر شوێنێک کە پێموابوو لەوانەیە لەوێ بێ، هەموو ئەو خێوەتانەی کە بە درێژایی ڕۆژ چووبووم، نەبوو و نەمدۆزییەوە.

زۆر تاسەییم کردبوو. ئەو هاوڕێی ڕێگەی کۆچبەریم بوو و هەموو شتم پێدەگوت. باسی خەڵکم بۆ دەکرد، باسی ڕێگە، باخی زەیتوون، ئەو سەوزایییە بەهەشتییانەی لە عەفرینەوە تا عەین دارا کە پێیدا دەرباز دەبووین، هەروەها شتە خەمگین و شتە خۆشەکانیش. ئەوم لەگەڵ خۆم تا کەمپ هێنا کە هاوڕێم بێ و دەرد و ئازار و شاییەکانی خۆمی بۆ بگێڕمەوە. باسی ئازارەکانی کۆچبەری و شاییەکانم لە شەڕانم بۆ دەکرد، دەمویست پێی بڵێم کە چۆن پیاوێک لە تووڕەییدا و ڕقدا دەمری. بەڵام نەمدۆزییەوە! بڵێی بۆ

کوێ چووبێ؟ دەمویست ڕستەیەک بنووسم کە وەک زەنگەکەی دەبستان لە گوێمدا دەزرنگایەوە. دەمویست لە دیوی دەرەوەی خێوەتەکەمان بنووسم: "هەی لەم خێوەتە نیم". هەر کە بیدۆزمەوە دەبێ لە پێش کەمپە پێی بنووسم: "هەی لەم کەمپە نیم".

جگە لەوەش دەمویست باسی ئازارە سەیر و سەمەرەکەی خۆمی بۆ بکەم. ئەو ئازارەی هێندی هێندی بە پێستمدا بڵاوە دەبووەوە.

لەو ڕۆژەوەی گەیشتووینەتە ئەم کەمپە هەست دەکەم پێستم وشک دەبێ. پێستم وەک تەختەی لێدەهات، یان ڕاستتر وایە بڵێم وەک گەچی لێدەهات. کاتێک قامکم بۆ دەبرد لە هەر کوێمدا بووایە لە ڕوخسار، گەردن، زگ، ڕان و ئەژنۆ تەنانەت پاژنەی پام، ئاسەواری گەچم بە سەر قامکەکانمەوە دەدیت. سەیر بوو ئەو ئازارە، ڕۆژ بە ڕۆژ پێستم وشکتر دەبوو. تەنانەت کێریشم وشک دەبوو و ڕەنگەکەی بەرەو سپی بوون دەچوو.

کاتێک لای خاڵۆم باسم کرد، دڵنەوایی کردم و گوتی:

- لەوانەیە جۆرێک سپاسم بێ.
- سپاسم؟
- ئەرێ سپاسم. ئەی نەکا پێت وابێ بەچاوەوە بووبێ خەزالول!

- خـۆت لە ڕێـگەدا وتـت پێسـت وشـک بـووە و قەڵەشیوە.

خاڵۆم لەبریی ئەوەی وەڵامم بداتەوە، نیگایەکی تیژی تێبڕیم، من دریژەم بە قسەکانم دا:

- بەڵێ خۆت وتت. بەڵێنیشت پێدام بمبەی بۆ لای دکتوری پێست لە حەڵەب.

سەرێکی لەقاند و گوتی:

- ئەرێ ڕاسـتە کـامۆ. بەڵێـنم پێـدای. دیسـانیش بەڵین دەدەم: ئەگەر لەم کەمپە دەرچین دەتبەمە لای باشترین دکتوری پێست لە حەڵەب.

دکتـورەکەی کەمـپ، حەبێکـی ئاسـپرینی پێـدام و هەنـدێک شـتی گـوت کە لێـی تێنەگەیشـتم. دوای ئەوەی هـاتینە دەر، خـاڵۆم پێکەنـی، هەنـدێک یـاریی بە قوتـووی حەبەکـان کـرد وەک ئەوەی قوتـووی نەفتکـان بـێ و گوتی:

- ئەم دکتورانە دەرچووی سۆڤییەتی ڕەحمەتین. کەمێک لە کەر زاناترن.

- قوتوویەک تەبەشیری پێ بدایەتم باشتر بوو.

- چیت لێدەکرد؟

- لە سـەر خێوەتەکەمـان دەمنووسـی: لەم خێوەتە نـیم. تەبەشـیرەکانی دیکەشـم دەهێنشـتەوە بـۆ شتی دی.

خالۆم زیاتر پێکەنی. بە دەم پێکەنیەوە چووینە نێو خێـــوەتە دەرگـــا شـــینەکەمان کە هێمـــای UNCR بە سەرەوە بوو.

ئەگەر تەبەشیرە ونبووەکەم دەنگم ببیسێ دەڵێ: جا تۆ چۆن ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان دەناسی کـا ـی دەڵەمیز؟

# لقی زەیتوون

١٠فلبث ایضا سبعة ایام اخر وعاد فارسل الحمامة من الفلك، ١١فاتت الیه الحمامة عند المساء، واذا ورقة زیتون خضراء في فمها. فعلم نوح ان المیاه قد قلت عن الارض.

بەیانییەک بە هۆی دەنگی هاتوهاوارێکی نائاسایی لە پێش خێوەتەکەمان، لە خەو هەستام. تەنیا چاوی چەپم هەندێک کردەوە کە خەوەکەم نەڕوا. دایکم دەستی خستبووە پشتی پاڵی دابوو بە دەرگای نیوەکراوە و بە سەرسوورمانەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. کە زانیم شتێکی نائاسایی لە دەرەوە ڕوو دەدات، چاوی ڕاستیشم کردەوە. دەستبەجێ ئامبولانسی مانگی سوورم دیت کە لە بەر دەرگای خێوەتی ئیبراهیمی جیرانمان کە پێمان دەگوتم مامە بلە، ڕاوستاوە. مامە بلە کۆچبەرێک بوو لە یەک لە گوندەکانی مەیدانکێ. من بە دایبییە نەفرەتییە پڕ لە میزەکەمەوە هەروا بە ڕاکشاوی مامەوە و لە دەرگاوە سەیری دەرەوەم دەکرد. لە خۆم ڕانەدیت لە نێو نوێن بێمە دەرەوە، لە دایکم پرسی:

- ئەوە چی بووە؟ چ قەوماوە؟

دایکم کە هێمای سەرسوورمان بە ڕوخسارییەوە بوو، دەستی ڕاستی لە پشتی بەردا و بەرەو خێوەتەکەی بەرانبەر ڕایکێشا و چەند جاران لە حەوادا شەکانییەوە. من هیچی لێ تێنەگەیشتم. ئالان لەدەرەوە بوو، لەپڕ سەری لە دەرگاوە هێنایە ژوور و گوتی:

- کامۆ کامۆ. حەمیدەیان برد بۆ نەخۆشخانە.

شتێکی نوێ نەبوو. حەمیدە هەموو جارێ لەسەرخۆ دەچوو و دەیانبردە لای دوکتور یان ئامبولانس دەهات و دەیبردە نەخۆشخانە تا دەهاتەوە هۆش و ئیدی دەیانگەڕاندەوە. بابەتەکەم لا گرنگ نەبوو و ویستم لە نێو نوێن بێمە دەر، بەڵام هەستم کرد لەشم وشک بووە. دەستم برد بۆ ناو ڕانم، دیتم وەک کۆتەرەی دارە سەوڵێکی پڕ، وشک بووەتەوە. یارەببی ئەوە چییە! بڕوام نەدەکرد.

- خەریکە دەبمە دار.

ئەمەم بە خۆم گوت و بە خۆم پێکەنیم کاتێک وێنای ئەوەم کرد کە دار زەیتوونێکی باریکی نێو باخە زەیتوونێکم.

ئامبولانسی مانگی سوور بە دەنگە پیسەکەیەوە دوور کەوتەوە، دایکم دەرگای شینی بەردایەوە و لەگەڵ ئالان بە ترسەوە هاتنە نێو خێوەت.

من وشک له نێو جێدا مامەوە. به هیوا بووم دەرفەتێکم دەست کەوێ که هەستم و خۆم له بەلای هەموو ڕۆژان ڕزگار بکەم.

دایکم هیچی نەگوت.

ئەو ڕاهاتبوو که له نێو نوێنەکەمدا وازم لێ بێنێ لەو ڕۆژەوە که زانیی میز به خۆمدا دەکەم. ئەو دەیزانی زۆر دڵم به خۆم دادەمێنێ و نامەوێ کەسێک پێم بزانێ، ئیدی وازی لێهێنام. خۆی به کاری ماڵەوە خەریک کرد و کەوت بەکۆی پاک و خاوێنی و منیش ئەوم خافڵاند و داپیپیەکەم دەبرد دەمخستە نێو سەتڵی زبڵەکە. ئەمە وەک گرێبەستێکی نەنووسراو وابوو له نێو من و دایکمدا.

بەڵام ئەم بەیانییە ئالان دڵی به قسەکردنەوە بوو. له ژوور سەرم دانیشت و وەک چیرۆک بگێڕێتەوە، گوتی:

- حەمیده دیسان کەوت. دیتم که چۆن کەفی سپی له دەمی دێته دەر. ئەو هەڵدەلەرزی و هەڵدەرزی و چاوەکانی سپی بوونەوە. دایکی دەگریا و دەیجووڵاند و بانگی دەکرد که هەستێ. کاتێک مامه بله هات جەستەی لەسەر عەرز ڕاکشاوی حەمیدەی زۆر هەژاند. بەڵام ئەو بەردەوام هەڵدەلەرزی و کەفی وەک کەفی شامپۆ له دەمیەوە دەهاته دەرەوە. دواییش ئامبولانس هات و بردی.

- یانی ئەمڕۆ وەک ڕۆژانی پێشوو نەبوو؟
- دایکی دەیگوت ئەمە یەکەمجارە کەف دەکەوێتە لای لێوی. ڕاستی کامۆ بۆچی کەف دەکەوێتە لا لێوی مرۆڤەکان؟

وەڵامیم نەدایەوە، هەستا لێم دوور کەوتەوە. هەستم کرد لەشم کەمێک نەرم بووەتەوە، لە ژێر لێفەکەدا داییبیم لە خۆم کردەوە و خستمە توورەیەکی نایلۆنیی ڕەش. دوای ئەوەی دیتم دایکم و ئالان ئاگایان لێم نییە، چوومە دەرەوە.

هێدی هێدی ڕۆیشتم تا گەیشتمە زبڵدانێک کە وەک گردێکی بچووک، بەرز ببووەوە و کیسەکەم فڕێدایە سەری. لەوێ بیجامەکەم داکەند، میزم کرد و دیسان گەڕامەوە. لە نزیک خێوەتەکەمان تانکەرێکی سووری ئاو هەبوو. نازانم بۆچی ڕەنگی تەنکەرەکانی ئەم کەمپە سوورە؟ لەوێ دەست و دەموچاوم شوشت و گەڕامەوە خێوەتەکە.

خێوەت هەموو وەک یەک دەچن. زۆر جاران منداڵ سەریان لێدەشێوێ و دەچنە خێوەتی خەڵکی دی. کاتێک چاویان بە ڕوخساری خەمگینی بیانی دەکەوێ و بەترس و شەرمەوە دێنەوە دەر.

کە گەیشتمەوە خێوەت، ئامبولانسەکەش گەیشتە خێوەتی مام بلە. دیتم حەمیدە لێی دابەزی و لقە زەیتوونەکەی بە دەستەوە بوو. ئەم لقە زەیتوونە لەو

ڕۆژەوە هـــاتووەتە کەمـــپەکە هەر بەدەســـتیەوەیە. ڕوخساری خەمگین بوو و سەیری ئەو با بۆگەنیوەی دەکرد کە بە نێو خێوەتەکاندا دەڕۆیشت.

***

لە ســەرەتای هاتنماندا پێموابـوو ئەو کـچە لە ژێـر کاریگەریی شەڕدا وای لێهاتووە. حەوت ساڵێک تەمەنی بـــوو و لقـــی زەیتـــوون چـــرکەیەکیش لە دەســـتی دانەدەکەوت. لقێکـی ســی بسـتێک درێـژ. زۆر جـاران دەمدی لقەکە دەچەقێنی بە زەویدا، دوو مەتر لێی دوور دەکەوێـــتەوە و دەســـت پێـــدەکا بەردی تێـــدەگرێ و دەقیڕێنێ:

- ئەمە بـــاوکمی کوشـــتووە. ئەمە قـــاتڵە. لقـــی زەیتـوون بـاوکمی کوشـتووە. هەی بە نەفـرەت بی.

جارێکیش دیتم کەوتووەتە نێو خێوەتەکان و لقەکان لە بەرد یـان ئاسـن یـان هەر شـتێکی ڕەقـی بەردەست بکەوێ دەدات و هاوار دەکا:

- هەرچۆن تۆ باوکمت کوشت منیش تۆ دەکوژم. پارچەپارچەت دەکەم.

جارجارە فێی لێدەهات، بەڵام دواتر هەڵدەستایەوە و خۆی لە باوەشی دایکیدا دەشاردەوە و دەگریا.

بەڵام دۆخەکەی ئەم بەیـانییەی وەک هەمـوو جارێـک نەبوو.

***

- جا توخوا کەسێک ماوە ئەم شەڕە حیزە کاریگەریی لەسەری دانەنابێ؟ مەگەر منداڵێک ماوە هۆشی لە جێی خۆیدا بێ؟ تاوانی ئەم کچە منداڵە چییە کە باوکی لە پێش چاوی کوژراوە؟ ئەو هەژارە ئیدی لە کوێ ئاسایشی دەست دەکەوێ؟

شەوێکیان، ئێمە تازە هاتبووینە کەمپ، مامە بلە لە خاڵۆمی پرسی، چاوەڕێی وەڵام نەبوو و درێژەی پێدا:

- عەلی کوڕم! بڕوا بکە شوێنێکی ئارام نەماوە. نەک هەر لە سووریا، لە تەواوی دونیادا شوێنێکی ئارام نەماوە.

- ئەرێوەڵڵا مام برایم. تۆ سەیریماڵباتی ئێمە بکە! ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی حەڵەب بووین، دەزانی ئەو ناوچەیە چی بەسەر هاتووە. دایکم لە بومبارانی نەخۆشخانەدا کوژرا. خوشکەزایەکی بچووکم بە بومبای کۆپتەرێک لە گەرەکی مەساکینی حەنانۆ مرد. مێردی خوشکم دیلی داعشە. ماڵباتەکەمان پەرش و بڵاو بووە، ئیدی دوو کەسمان پێکەوە لە شوێنێک نین. من خۆم هاتم بۆ عەفرین چون ئارام بوو. پاشان خوشکم و دوو منداڵەکەی هاتن. ئەوا ئێستاش ئەسیری داهاتوویەکی نادیارین.

من بێدەنگ گوێم لەم قسە خەمگینانە ڕاگرتبوو. دووکەڵی جگەرەی هەردەکیان کەتبووە ژوور سەریان و ڕوخسارییانی لە پێش چاو دەشاردەوە. بەڵام ئەو دووکەڵە خەستە نەیتوانیبوو ببێتە پەردەیەک کە نەهێڵێ پاشماوەی قسەکانیان ببیسم.

"ئێمە لە گوندی گەمرووکی مەیدانکێ هەڵهاتین و هاتین لە ناوەندی عەفرین نیشتەجێ بووین. ڕۆکێت و بومبا دەبارین. بە سەر زەویدا، بە سەرماڵەکانی ئێمەدا لە گوندە بچووکە. جگە لە هەلاتن چارەیەک نەبوو. وەلاهی وە بیلاهی کوڕم من ئەو پیاوە نیم کە ماڵ و حاڵی خۆم جێ بهێڵم. نا. مامە بلە ماڵی خۆی جێناهێڵێ، هەرچیش ببێ. بەلام ڕۆح شیرینە و سەلامەتیی ماڵبات ئەرکی منە. بومباش کوێرە کوڕم. کوێرە و خەڵکی مەدەنی و چەکدار لێک جودا ناکاتەوە. درۆ دەکەن ئەوانەی خۆیان بە لایەنگری خەڵکی مەدەنی پیشان دەدەن. درۆزنن. ئەوان بە ئەنقەست خەڵکی مەدەنی دەترسێنن تاوەکوو بە کەیفی خۆیان لێی بدەن. ئێمە لە ترسی لقە زەیتوونی نەفرەتی کە وەک شووڵک لە پشت و سنگمانی دەدا، هەڵهاتین و بە سەلامەت گەیشتینە عەفرین. لە ماڵی کچەکەم لە گەڕەکی مەحموودیە بەجێ بووین. بەڵام ئەو نەفرەتییانە وازیان لێ نەهێنان. ئەمجارە هۆڤانەتر دامانیانە بەر قامچی. ئەمە چ لقێکە عەلی؟ چ لقێکی شێتە؟ چ لقێکە کە یەکسەر دڕکە؟"

مامە بلە کەمێک بێدەنگ ما. مژێکی قوولّی لە جگەرەکەی دا و لە نێو لێوی دەریهێنا و هەورێک لە دووکەڵی بەردایەوە سەر خۆی. سووتکی جگەرەی داتەکاندە نێو تەپڵەکێکی شووشە کە لە پێشی بوو. دیسان جگەرەی هەڵگرت و مژێکی قووڵتری لێدا و تەواوی کرد. لەپڕ جگەرەی لە نێو تەپڵەکدا پلیشاندەوە و درێژەی بە قسەکەی دا:

"تا لە دونیادا بم ئەو هەینییە ڕەشە لەبیر ناکەم. شانزەی ئادار بوو. سوپای تورک ڕایگەیاندبوو کۆریدۆرێکی هێمن لە باشووری عەفرینەوە بەرەو گوندی تورونده دەکاتەوە. ئێمە ویستمان بەرلەوەی هێرشکەر، بازنەی گەمارۆی سەر عەفرین تەنگ بکەنەوە، لێی دەرچین. ئەو ڕۆژە ئاسمان بە هەور داپۆشرابوو و نەرمە بارانێک دەباری. گوتمان ئەم بارانەی نیشانەی خێرە و کۆتایی موسیبەتە. گوتمان بەڵکوو هەندێک ئاسایش و ئارامی لەم شارەدا ببینین. لانیکەم فڕۆکەکان لە ڕۆژی بارانیدا بومباران ناکەن. گوتیشمان ئێمە مەدەنین و لە سایەی کوریدۆری ئارامدا، گیانی خۆمان دەرباز دەکەین.

چەند خولەکی پێنەچوو دیتمان بومبا بە شێوەیەکی هیستریک بەسەرماندا دەباری. بانگم لە ژن و منداڵ کرد کە هەڵبێین. جا بۆ کوێ؟ کوڕە گەورەکەم پرسیاری کرد. گوتم منیش نازانم. بەڵام بە تەجروبەی

خۆمدا دەزانم ئەم بومبارانە بەردەوام دەبێ. هەڤاڵ لە گەڕەکەکەدان. دوژمنیش بۆ کوشتنی شەڕڤانێک ئامادەیە گەڕەکێک وێران بکا. ئەوە قانوونی شەڕە. وەها وەڵامی کوڕەکەم دایەوە. حەمیدەی نەوەم گریا و داوێنی کراسەکەی دایکی گرت و قیڕاندی: ماما من زۆر دەترسم. ئەمانە دەمانکوژن. من دڵنەوایم کرد، دەشمزانی کە درۆ دەکەم: مەترسە، هیچ نابێ. ئێستا دەچینە ژێرزەمینەکە. ئاخ کوڕم ئاخ. چەندە ئێمەی مەزن لە شەڕدا درۆ لەگەڵ منداڵان دەکەین و پێمانوایە بچووکن و لە هیچ تێناگەن. منداڵ لە ئێمە باشتر دەزانن واتای شەڕ چییە عەلی کوڕم. ئەوان زیاتر لەهەر کەسێک هەست بە تاڵییەکەی دەکەن.

لە کۆتاییدا لە ماڵ هاتینە دەر. من و ژنەکەم و کوڕەکەم و کچەکەم و مێردەکەی و منداڵەکانیان. نیەتمان ئەوە بوو خۆمان بگەیەنینە حەشارگەیەک تا بومباران ڕادەوەستێ. بەڵام پاش کەمێک دوای هاتنە دەر لە ماڵ، هێشتا لە گەڕەکی مەحموودیە بووین، بومبا بەسەرماندا باری.

- هاوەنە. ئەوە هاوەنە.

کوڕەکەم گوتی.

گوتم خێراکە کوڕم. ئێستا کاتی ئەوە نییە بزانین ئەوە بەسەرماندا دەباری چییە. پێویستە خۆمان بگەیەنینە شوێنێکی پارێزراو. هێشتا قسە لە دەممدا بوو،

پارچەیەکی بومبا بەر ڕانم کەوت. لە گۆشەیەک دانیشتم سەیری برینەکەم بکەم، دیتم کوڕەکەم لە ناوەڕاستی شەقامدا داڕووخا. دەستبەجێ ڕۆح لە بەدەنی دەرچوو. وەک دارێک کە گەردەلووول لە ڕەگەوە هەڵیکێشێ، کەوت. زاواکەم، باوکی حەمیدە، کەمێک لەولاترەوە بەر پارچەیەکی کوشندە کەوت. کچە ناوینەکەم کە زگی هەشت مانگان بوو بریندار بوو، بە هۆی برین و ترسەوە منداڵەکەی لەبار چوو. دایکی حەمیدە لە دەستەوە بریندار بوو. کچەکەی دیکەشم هەروا. شەقام پڕ بوو لە لەش و ئەندامی پارچە بوو. کاتێک برینێک هەندێک سارد بووەوە، هەستم بە ژانێکی زۆر کرد، بانگم لە کچەکەم کرد بە هاوارمەوە بێ.

پوورە فەریدە، ژنی مامە بلە، دەنگی لێوە نەدەهات، مرۆڤ وایدەزانی لاڵە. بەڵام لەپڕ قسەی مێردەکەی بڕی و گوتی:

- بانگت لە کچەکەت کرد؟ خەڕەفاوی بلە یان مێشکت تێکچووە و ئیدی هیچت بیر ناکەوێتەوە.
- چی؟ تۆ وتت چی فەریدە؟ من بانگی سینەمم نەکرد؟
- سینەم؟ بەڕاستی خەڕەفاوی. خۆ سینەم لەوێ نەبوو.
- ئەی من داوام لە کێ کرد بە هاوارمەوە بێت؟

- داوات لە من کرد خەرەفاوەکەم. منیش هاتم و برینەکەتم بە دەسماڵێک بەست.

دوای ئەوەی پـــووره فەریـــدە دوا ڕســـتەیەکی بە شـێوەیەکی سـەربەرزانە بە دەنگـی بەرز گـوت، ڕووی کردە خاڵۆم و باسی ڕۆژە سەختەکانی کرد:

"کوڕم وەڵا مـن بە چـاوی خـۆم دەیـان بومبـام دیـت بەسـەر گەڕەکەکەدا بـارین. دوای ئەوە کەسـێک هـات و کەوتە ئەو شـەقامەی ئێمەی تێدا بـووین. دەمانویسـت هەڵبێین. نازانم چەند کەس بوونە قوربانی، بەڵام شەقام پڕبوو لە لەش و جۆگەلەی خوێن پێیدا دەڕۆیشت. نەوە بچووکەکەم، حەمیدە، چاوی بە باوکی کەوت لە خوێندا گەوزاوە، هۆشی لە دەست دا. بەملا و لادا دەڕۆیشت و دەیقیڕاند. من وازم لە کوڕ و زاواکەم هێنا کە خەڵتانی خـوێن بـوون و بەرەو حەمیـدە هەڵهـاتم.تـا گـرتم. لەو کاتەا تیمـی پزیشـکی لە نەخۆشـخانەی عەفرینەوە هـاتن بۆ ئەوەی لەشەکان کۆ بکەنەوە و بریندارەکان بگەیەننە نەخۆشخانە. ئێمەیان خستە پیکاپێک و لەشی کوژراو و بریندارەکانیشیان لەگەڵ ئێمە بردە نەخۆشخانە. حەمیدە هەر ڕانەدەوەسـتا. لە پشـت پیکـاپەکەدا یەکسـەر تەڕ ببووین. دکتورێک گوتی حەمیدە شۆک بووە. ئەو هەر دەیقیڕانـد و هـات و هـاواری دەکـرد و قسـەی هەڵیت و پەڵیتی دەکرد تا هاتن و دەرزییەکـی ئارامبەخشـیان لێدا و خەواندیان. مەگەر ئێمە چیمـان کـردووە کە ئەمەمـان

بەسەر هات؟ تاوانی ئێمە چییە؟ ئێمە کارمان بە هیچ نەبوو. لە دونیای خۆماندا تەنیا چنینەوەی زەیتوونمان دەزانی. گوێمان لە دارە سەوزەکانمان دەگرت. بە هیوای وەرزی چنینەوە دادەنیشتین و دانە دانە زەیتوونمان دەچنییەوە و دەماننارد بۆ مەعسەرە. ئێمە ئاوا دەژیاین تا گورگ هێرشیان هێنا. خۆزگە لە گوندەکەمان دەمرم و لە ژێر دار زەیتوونێکدا ئەسپەردە دەکرام و نەدەبوومە کۆچبەر و ڕەزیلیی ژێر خێوەتی وەک قەرەچیم نەدەدیت".

***

پووره فەریدە لە کەمپەکە بە ناوی خاوەن کلیل دەناسرا. لە ڕێگەی کۆچبەریدا کلیلەکانی ماڵەوەی ون کردبوو. ئینجا تووشی کێ بهاتبا لێیدەپرسی:

- کلیلێکت بە بەنێکی شینەوە نەدیوە؟

جارێک ژنێک پێی گوت:

- عەفرین یەکسەر وێران بوو تۆش پرسیاری کلیلەکەی ماڵی خۆتان دەکەی؟

پووره فەریدە زۆر تووڕە بوو و بە دەنگی بەرز لەگەڵ ژنەکە بەشەڕ هاتبوو و گوتبووی:

- مەگەر من عەفرینم دۆڕاندووە؟ ڕاستە عەفرین لەدەستچوو، بەڵام تاوانی من نییە. لە بەرپرسەکان بپرسە بۆچی؟ لەو بەرپرسانە

بپرسە کە کەوتوونەتە دوای خەڵک و هەڵاتوون. لەوانەی کە سواری ئۆتۆبووس بوون خۆیان خستە نێو خەڵکی مەدەنی. ئەوانەی پارەی کۆکراوەیان لەگەڵ خۆیان برد و ڕۆیشتن. من خەمی ماڵەکەی خۆمە و بۆی دەگریم. ئەوان پارە گەورەترین خەمیانە. تەنانەت لە گۆڕی شەهیدانیش گرنگترە بۆیان. ئێمەش هەرکاممان بە بیرەوەرییەکانی خۆیەوە دەناڵێنی.

پوورە فەریدە خێوەتێک نەما کە نەچێت و پرسیاری کلیلەکەی لێ نەکات. بەوهۆیەی ئێمە جیرانیان بووین زۆر جار دەهاتە لامان و باسی ماڵەکەیان و کلیلە ونبووەکەی دەکرد. جارێکیان لێم پرسی:

- شتێکی گران لە ماڵەکەتاندا هەبوو پووری؟

دەستماڵەکەی دا بەسەر دەمیدا و بێ ڕاوەستان گوتی:

"لە دونیادا هیچ شتێک گرانتر لە ماڵی مرۆڤ بۆ خۆی نییە کوڕم. تەنانەت جاڵجاڵووکەش ناتوانێ بە بێ ئەو ماڵە خاو و سستەی بژی. ماڵەکەم بەو شتانەی تێیدایە گران بوو. ڕاستە ئێمە زێڕ و پارەمان لە دوای خۆمان جێهێشتووە، بەڵام ماڵەکەمان بۆ من هەموو دونیایە. دار پرتەقاڵ، دارمێو، یاسەمینی هەڵکشاو بە دیواردا و تەنانەت من بۆنی خۆشمم لە دوای خۆم جێهێشتووە و هەڵاتووم. لەوانەیە لە ڕقا بمرم کاتێک دێتە پێش چاوم

ئەو سووک و چرووکانە هەموو شتمان تالان دەکەن.
ئەری ئەوانە هەموو شت تەنانەت دەسمالی بووکێنییەکەشم تالان دەکەن و دەیبەن".

کولی گریان نەیهێشت پوورە فەریدە کۆتایی بە قسەکانی بێنێت، هەستا ڕۆیشت و ئارام پرتەپرتێکی کرد و سینگی خۆی کوتا.

لەپڕ حەمیدەی نەوەشی کەوتە دوای، لقە زەیتوونەکەی دەستی دا بە عەرزا و جنێو پێدەدا.

# لاڵی

دایکی منە.

ئەو ژنەی ئەم شەڕە گووە کردوویەتە نیوە مرۆڤێک.

ئەو ژنەی ئەم شەڕە زماندرێژە، زمان و قسەکردنە شیرینەکەی لێ ستاندەوە و ئیدی ژنانی ئەو کەمپە هەموو پێی دەڵێن لاڵی.

لاڵی، دایکی من کە لە زانکۆی حەڵەب بە بەرزترین پلەوە، لە بەشی زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی دەرچووە. دایکم کە چوار زمانی بە باشی دەزانی. لاڵی لەیلای دایکمە کە کاتێک قسەی دەکرد هەموو کەسی بە لۆژیکە بەهێزەکەی ڕادەگرت.

بەڵام ئێستا لە گۆڕستانێک بێدەنگترە.

نە گرمەگرمی فڕۆکە، نە زرمەزرمی و نە دیمەنەکانی مەرگ لە منبج نەیاندەتوانی دایکم بێدەنگ و لاڵ بکەن. دەنگی ئەو داعشییە پیسانە ئەو کاتەی داوایان دەکرد ئێمە ماڵەکەمان لە منبج چۆڵ بکەین، نەیتوانی لاڵی بکا. هیچ شتێک نەیتوانیبوو لاڵی بکات.

بەڵام.

بەڵام پارچەی بومبایەک لە ڕۆژبوونی مەیسۆی خوشکی بچووکمدا ئەوی لاڵ کرد. پارچەیەک کە لەوانەیە بەقەد تەبەشیرێک بێ، خوشکە پێنج ساڵانەکەمی کردە دوو لەت.

لاڵی. ئەری لاڵی.

بەڵام دایکم لاڵ نەبوو. نا نا قەت لاڵ نەبوو. ئەو بە زۆر زمان قسەی دەکرد. ئەو لە شەوانی منبج و حەڵەب و شەڕان گەلێک چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە. گەلێک چیرۆک. زیاتر لەو خاڵی پشکنینانەی پێیدا دەرباز دەبووین، چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە. دایکم لاڵ نییە ئەی هاوار. ئەو دەرچووی زانکۆیە.

ئەری دایکم دەرچووی زانکۆیە. ئەو ئەدەبیاتی ئینگلیزی خوێندووە، بەڵام ئەم شەڕە فرەوێژە ئەوی لاڵ کردووە. بە زمانی ئاگر، بە زمانی بومبا، بە زمانی ئەو هاوەن و بومبانەی لە گەڕەکی مەساکنی حەننانۆی حەڵەب تەقینەوە، دایکم لاڵ بوو.

***

لەو کەمپە پیسە هیچ شتێک وەک ئەو ناونیتکەی لە دایکمیان نابوو، دڵتەنگی نەدەکردم. خەڵک هەمیشە دەیانگوت لاڵی. هیچ کەس نەیدەگوت مامۆستا لەیلا یان

دایکی کامیران. هەموو ژنان لەوێ ناویان هەبوو، دایکم نەبێ. لەقەبی ئەو هەر لالێ بوو.

لە منبج، باش دێتەوە یادم، خەڵک حسێبیان بۆ دایکم دەکرد. هەموو کەس ڕێزی دەگرت. چونکە پێش هەموو شت هاوسەری دوکتورێکی جەڕاحی نەخۆشخانەی ئیبنی سینا بوو. جگە لەوەش خۆی مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو. داعش بەو هەموو توندوتیژییەیەوە، ڕێزی لیدەگرت. زۆر جاران ئەندامانی داعش هەوڵیان دا ئێمە لە ماڵەکەمان دەرکەن، بەڵام ڕکابەریی دایکم و مانەوەی لە ماڵەکەدا، پیلانەکانی ئەوانی تێک دا. ئەو لە ماڵەکەدا مایەوە، خۆی بەستەوە بە بۆنی باوکم و بیرەوەرییەکانییەوە. هیچ کەس نەیتوانی ئەو لەو ماڵە دەربکا، بەڵام باپیرەم ڕۆژێک هات و ئێمەی لەگەڵ خۆی بردە حەڵەب.

بەڵام لەم کەمپە بێڕەونەقە، ناوی لالێی بەسەردا بڕا. کەسێک لێی نەدەپرسی تۆ کێی یان لە کوێوە هاتووی!

خێوەتی لالێ.

کۆچبەر ئاوا ناویان لە خێوەتەکەی ئێمە نابوو. ئەوان نەیاندەزانی لەو خێوەتەدا سێ کەس هەن کە گەلێک زمان دەزانن.

دە لێی گەڕێ دەی. ئێمە منداڵەکانی لالێین، خێوەتەکەشمان خێوەتی لالێیە. کێشە نییە!

ئێمە لە ناچاری ئەو ناسناوەمان قەبووڵ کرد. چاوەڕوان بووین ئەو شەڕە قەحبەیە ڕاوەستێ، ئەو شەڕەی کە ئەوا شەش ساڵ بوو نقەنقی بوو بێ ئەوەی کەس بتوانێ بێدەنگی بکات و ڕایبگرێ. ئێمە ئەو ناسناوەمان بۆ دایکم قەبووڵ کرد، بۆ خۆیشمان قەبووڵمان کرد کە هەتیو بین تا ئەو کاتەی باوکی ونبوومان بگەڕێتەوە.

***

بە بزەکەی سەرلەبەیانیی دایکمدا دەمزانی کە باوکمی کە خەودا دیوە. دەچووم بۆ لای بە ئاماژە لێم دەپرسی ئایا باوکمی لە خەودا دیوە؟ ئەویش بزەیەکی دەکرد و سەری خۆی بە واتای بەڵێ دەلەقاند.

ئاااخ چەندە بیری دایکمم کردووە کە خەونێک لە خەونەکانم بۆ بگێڕێتەوە. تەنانەت نیوەخەونێکیش بێ.

دەمزانی خەو بە باوکمەوە دەبینێ هەروەک چۆن ئێمەش خەونی پێوە دەبینین. هیوام وابوو هەر نەبێ بەشێک لە خەونەکەیمان بۆ بگێڕێتەوە. بەڵام ئەو هەروا لاڵ دەمایەوە. تەنانەت ڕۆژێکیش هەوڵی نەدا هەستەکانی خۆی بۆ ئێمە بنووسێ. زۆرجار قەڵەم و کاغەزم بۆ دەهێنا و لێیدەپاڕامەوە: قوربانت بم دایکە گیان هەر ڕستەیەک بنووسە. ئێمە دەمانەوێ تێبگەین

بۆچی قسە ناکەیت و چیت بەسەرهاتووە؟ زۆر تکام لێکرد بەڵام سوودی نەبوو.

ئەو ئیدی لاڵە.

لاڵبوونیش لفی مردنە. چەندە دژوارە کە من چوار ساڵان لەگەڵ دایکم بژیم بێ ئەوەی دەنگێکی لێ ببیستم! چەندە بۆ من دژوارە کە هاتوهاوارەکانی بەسەر خۆم و براکەمدا نابیستم! بیری هەموو شتم کردووە. تەنانەت بیری جنێوە ناسکەکانیشم کردووە. بیری بزەکانی، پێکەنینەکەی و پێش هەموو شتێکیش بیری چیرۆکە خۆشەکانی پێش خەوتن.

من بیری بێدەنگییە جوانەکانی پێش لاڵبوونیشیم کردووە. بیری ئەوەم کردووە کە ڕوخسارە شیرین و جوانەکەی بخاتە نێو هەردوو دەستی و بێدەنگ و بەختەوەر لە ئێمە بڕوانێ و زەردەخەنە لە سەر لێوی بێ.

ئاااخ. تۆ چیت بەسەر ئێمە هێنا ئەی شەڕی پیس؟

***

بەیانییەک دایکم ویستی نانی بەیانیی دروست بکا. بەیانییەکی خۆشی بەهاری بوو.

- من نانی بەیانییەک وەک ئەوەکانی شەڕانم دەوێ.

ئالانە کەرەی برام وەهای گوت.

- کۆچبەری و نانی بەیانیی خۆش؟ سوالْکەریی بە مەرج؟

وەهام بە براکەم گوت. دایکم نیگایەکی تیژی تێبڕیم و دەستی بەرەو هێلەکەکان ڕاکێشان و دەستی وەرسووڕاند وەک ئەوەی لە تاوەدا شتێک تێک وەردەدات.

ئالان لەو جوولەیە تێگەیشت و سەری بە واتای ئەرێ لەقاند.

***

دایکم بۆتانگازە بچووکەکەی داییساند و تاوەکەی خستە سەر و کەمێک زەیتی زەیتوونی ڕۆکرد. لە هەرێمی عەفرین هیچ کەس ڕۆن بەکار ناهێنێ. هەرچی بێ بە زەیتی زەیتوونە. لە هێلکەوە بگرە تا گۆشتی گوێرەکە.

لە نێو نوێندا مامەوە. دیتم کە دایکم چۆن لە نێو کاسەیەکدا هێلکە لێکدەدا و خوێ و نەعنا و هەندێک بیبەری سووری هێڕدراوی تێدەکا. داییکەم وەک هەمیشە پڕ بوو لە میزی نەفرەتی. چاوەڕێی دەرفەتێک بووم کە لە خۆمی بکەمەوە و بیخەمە عەلاگەکەی ژێر سەرینەم.

ئالان وەک پشیلەیەک کە مشکی دیبێ، لە پێش تاوەکە ڕاوستابوو. دەنگیم بیست کە بە دایکم دەڵێ ئەمجارەی

تـر خـۆی هـێلکە دروسـت بکـات. دایکـم پـاڵێکی پێوەنـا، بەڵام ئەو وەک منـداڵی بچـووک ڕقـی گـرت و پێـی لە عەرز خشـاند. دایکـم ناچـار مـا کاسـەی پـڕ لە هـێلە لێکدراوەکەی دایە دەستی. ئالان بە دەستێک کاسـەکەی گـرت و بە دەسـتەکەی دیـکەی تـاوەکە. نـازانم چـۆن و بـۆچی خـۆی نەوی کـرد کە کاسـەی هـێلکەکە لە سـەر عەرز دانی. کاتێک خۆی نەوی کرد دەستی لە تاوەکەش بەرنەدا. هەر کە دیتم زەیتی قرچاو ڕژا بە سـەر دەست و سینگ و ڕوخسـاریدا.

لە کەمتـر لە چرکەیەکـدا گەلێـک هـزری دژبەر لە سـەرمدا ئـاوێتە بـوون. گەلـۆ لە نێـو نـوێن هسـتم و بە هـاواری بـراکەمەوە بچـم، ئەوکـات لەوانەیە ڕازی بەخۆدامیزتنەکەم ئاشکرا ببێ؟ یان ئەمە وەک دەرفەتێک بقـۆزمەوە و داییـیە گەنیـوەکەم دەربێنم و فڕێـی دەمە دەرەوە، پاشـان بچـم هاوکـاریی بـراکەم بـکەم؟ دەبـوو بڕیارێک بەدەم و بە گوێرەی یەک لەو بیرۆکانە ڕەفتـار بکەم.

دایکم سـەری لێشـێوابوو، نەیدەزانی چ بکا. نەدەگریا. سەرم سـوورمابوو. بۆچی وا بێدەنگە و بانـگ لە کەس ناکـا؟ لەپـڕ بیـرم کەوتەوە کە لاڵە. دەنگـی نیـیە، وەک تەبەشیرە زەردە ونبووەکەم. تەبەشیریش دەنگیان هەیە ئەو کاتەی مامۆستا لە سەر تەختەڕەش پێی دەنووسـێ. کەواتە مـن بەرپرسـی براکەمم! خاڵۆشـم ڕۆژی پێشـتر

وەک هەمـــوو ئێـــواران تەمبـــوورەکەی هەڵگرتبـــوو و چووبـووە مـاڵی هاوڕێکـانی. لەخـۆم ڕانەدیـت هەسـتم. پێستی لەشم وشک ببوو. لە سەرەوە تا ژێر پێم هەستم دەکرد کەوتوومەتە نیو سەدەفێکی گەورەی نێو دەریا. هیچ ئازارێکم نەبوو، تەنیا لەشم قورس بوو.

هێندەی نەمابوو دەنگم هاتوهاواری براکەم خێوەتەکە بفڕێنێ. لە ئەنجامدا بڕیارم دا بە هـاواریەوە بچـم، ئـارام لە نێـو نـوێن هـاتمە دەر. لە ڕوخسـاری دایکمـم ڕوانـی دیـتم تژیـی ترسـە. خێـرا بۆتـان گـازەکەم کوژانـدەوە و بـــراکەمم هەڵگـــرت و لە زەیـــتە گەرمەکە کە ڕژابـــوو، دوورم خسـتەوە و ئـاوی سـاردم کـرد بە سـەر شـوێنە سووتاوەکانیدا.

دایکم سەری لێشێوابوو. جارێک دەچووە بەر دەرگای خێـــوەت، دەســـتی بەرەو ئاســـمان دەگـــرتەوە و بە خەمگینی سەیری خودای دەکرد و پاشان دەگەڕایەوە و لە ئـالانی دەڕوانی کە بەردەوام دەگریـا. جارجـارەش لە نێـو خێوەتـدا بە دەوری خۆیـدا دەسـووڕایەوە وەک ئەوەی لە شتێک بگەڕێ و دیسان دەهات سەیری ئالانی دەکرد و هەموو شتیان دەگوت.

***

بـراکەمم بـردە نەخۆشـخانەی کەمـپ. پەرەسـتارێکی قەڵەو کە سـوخمەیەکی سووری مـانگی سـووری لەبەر

بوو، هەموو جلەکانی ئالانی داکەند و تەماشای لەشی کرد کە بە زەیتی نەفرەتی سووتابوو. دەستی، سنگی و بەشێک لە دەموچاوی سووتابوو. پەرەستار مەڵهەمی ساوییە شوێنی سووتاو، هەندێک باندی تێپێچا و دوایش چەند حەبێکی ئازارشکێنی پێداین و بە شێوەیەکی وشک گوتی:

- ئەمە سووتانی پلە دووە، مەترسییەکی جیددی نییە.

من لە بەرخۆمەوە پێکەنیم و بەخۆم گوت: پلە دوو؟ مەگەر لە تاقیکردنەوەکانی خوێندگەدا سووتاوە؟

لە ڕێدا، کاتێک لە نەخۆشخانەی کەمپ دەگەڕاینەوە، بە ئالانم گوت کە لە باوەشی دایکمدا بوو: "خەمت نەبێ ئالان. پلەی دووش خراپ نییە." دواتر بە گاڵتەوە گوتم: "ئیشەڵڵا لە سووتانی داهاتوودا پلەی یەک بەدەست دێنی." دایکم بزەیەکی کرد، بەڵام ڕوخساری ئالان هەر بە تاڵی مایەوە و گوێی نەدایە گاڵتەکەی من.

***

بەرلەوەی بگەینە خێوەتەکەمان، دیتم کۆمەڵێک خەڵک خەریکی هەڵپەڕکێن. دواتر زانیم بەرپرسێکی باڵای سیاسی هاتووەتە سەردانی کەمپەکەمان.

ئالانم لە نێو خێوەت لە سەر جێگەکەی دانا و هاتمە دەرەوە بزانم ئەو بەرپرسە سمێڵقەڵەوە دەستبەتاڵە

چـــــی لەو کـــــۆمەڵە خەڵـــــکە هەژارە کە لە نێـــــو خێوەتەکانیانەوە ڕژاونەتە نێو مەیدان، دەوێ.

لەو سـاتەدا خـاڵۆم گەیشـتەوە. هەر کە منـی دیـت بە ترسەوە لێی پرسیم:

- کوا ئالان؟
- لە خێوەتە، دایکم لایەتی، بە زەیت سووتاوە.
- ئەی تۆ بۆ لە دەرەوەی؟ بۆچی لای دایکت نیت؟ لەوانەیە پێویستی پێت بێ.

خـاڵۆم چـاوەڕێی وەڵام نەمـایەوە، زۆر بە پەڕۆشـەوە ڕۆیشـت تـا گەیشـتە خێـوەت و لە تـاریکیی نـاوەوەی خێوەتدا ون بوو.

کاتێـک بەرپرسـی سـمێڵبۆق دیتـی ژمـارەیەکی بـاش خەڵک لە مەیـدان کۆ بوونەتەوە و چـاوەڕێی قسـەکانی ئەون، سـەیرێکی ئەو ڕوخسـارە پەرێشـانانەی کـرد و کۆکەیەکی لە خۆی هێنا. لەگەڵ کۆکیندا پرشـەی تـف لە دەمـی دەرپەڕی کە بـۆنێکی ئێجگـار گەنیـوی لێـدەهات. شـنەبایەک هـات و بـۆنە پیسـەکەی بە کەمـپەکەدا بـڵاو کردەوە. ئەو بۆنە ناخۆشـە، دڵـی تێکهاڵاندم، بە هەڵاتنـی گەڕامەوە خێوەتەکەمـان بـێ ئەوەی گـوێ لە قسـەکانی بگرم.

لە دەرەوە دەنگـی قەرەبـاڵغییەک هـات کە دروشـمیان دەگـوتەوە، چەپڵەیـان لێـدەدا و هەڕەشـەیان لە سـوپای تورک دەکرد.

خالۆم بە میهرەبانی دەستی ئالانی گرتبوو. کاتێک دەنگی دەرەوە هاتە گوێی، بە دەنگێکی مەلوول گوتی:

- کارەساتی مەزن ئەوەیە کە نەزانی کارەساتەکەت چەند مەزنە.

# لافاو

هەر کە دەچـــوو کـــۆڕی خەڵــکەکەی دەرەوە کە هـاتبوون گـوێ لە قسـەکانی بەرپرسـی سیاسـی بگـرن، زیاتر دەبوو. لەگەڵ زۆر بوونی خەڵک، وشـکبوونەوەی لەشی منیش زیاتر و فراوانتر دەبوو. لە پەنجەی پێمەوە تـــا قـــولاپەم و هەردوو ئەژنـــۆم و ڕان و گوڵمەکـــانم، پێســـتەکەی هەر وشـــک دەبـــوو. لەو ڕۆژە هەوریـــیەدا وشـکبوونی پێسـت ئـارامتر بـوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەسـتم پـێ دەکـرد. سـات بە سـات لە خـۆم دەڕوانـی. وشـکبوونی و سـپی بـوونەوە بـڵاوە دەبـووە، هەر وەک چۆن ئاو ئاوێتەی ئارەقە دەبێ و سپی دەبێتەوە.

بەڵام هەمـوو ئەو گۆڕانکـارییە هـیچ ئـازارێکی نەبـوو. نەک هەر ئــازاری نەبــوو، بەڵکــوو چێژێکــی ســەیری خۆشــی تێـدا بـوو کە نـاتوانم باسـی بـکەم. لەو چێـژە دەچـــوو کە لە لای مەزییەتـــی بێـــوەژن لە شـــەڕان دەمچەشـــــت. ئیـــــدی تێگەیشــــــتم کە خەریکــــــی تـــاقیکردنەوەیەکی گەورەم کە نـــازانم چـــۆن دەبـــێ.

بابەتەکەم شاردەوە هەر وەک چۆن چوار ساڵان بابەتی بەخۆدامیزتنەکەم شاردبووەوە.

دوانیـــوەڕۆ نەرمە بارانێـــک بـــاری و بەرپرســـەکە ڕۆیشت و خەڵک بڵاوەیان کرد و بێدەنگییەکی قورس سەرانســەری کەمــپەکەی گــرتەوە. تەنیــا دەنگــی چەنــد منداڵێک دەهــات کە لەبەر دەرگــای خێوەتەکــان یارییــان دەکرد و بەردیان دەگرتە تەنکەرە سوورە پیســەکان و بە هاتوهاوار بە نێو قوڕی کەمپەکەدا هەڵدەهاتن.

دەمەوە ئێــوارە بــاران تونــدتر بــوو و شڵپەشــڵپێکی هــۆڤی بە ســەر خێوەتەکانــدا دەســتی پێکــرد. مــن خــۆم نەدەترســام، گوێیشــم نەدایــێ. هەروەهــا گــوێم نەدایە ناڵەنــاڵەکەی ئــالان و سەرلێشــێواوییەکەی دایکــم و هــاتوچوونە بێهــۆکەی بەنێــو خێوەتــدا. بە گۆڕانکــارییە سەیرەکەی لەشی خۆمەوە سەرقاڵ بووم. لە بەیانییەوە گۆڕانکارییەکە دەستی پێکردبوو و ڕانەدەوەستا. چاوم لە ســەر پێســتم کە ئیــدی قرچەقــرچەکەیم دەبیســت، هەڵنەدەگرت. هەر کە خۆم لە نێو جێکەمدا ئەمبارەوبار بکردایە، پێستم دەستی بە قرچەقرچ دەکرد.

دوای نــزیکەی ســەعاتێک بــراکەم کە بەیــانی بە زەیت سووتابوو، چووە خەو. دوای ئەو دایکیشم خەوت. لەو ســاتەدا گۆڕانی لەشــم بەرەو تەبەشــیرێکی مەزن کامــڵ بــوو. بــوومە پــارچەیەک تەبەشــیری زەردی ڕاکشــاو لە نێــو نوێنــدا. ئیــدی لە میزکــردن بە خۆمــدا نەدەترســام.

تەبەشیر میز بەخۆیاندا ناکەن. ڕاستە کاتێک دەنووسن تۆزیان لێ هەڵدەستێ بەڵام وشکن و میز بە خۆیاندا ناکەن.

دایکم ئارام و ئاسوودە خەوتبوو. من زۆر بۆی خەمگین بووم. ئالانی برام وەک کۆترێک کە بە سەر سکڵەوە بێ، ئەمبارەوباری دەکرد. بۆ ئەویش خەمگین بووم. هەر دوو دەست و بەشێکی زۆر لە سنگی سووتابوو.

- خاڵۆم نیوە شەو دێتەوە وەک هەموو شەوێک بە هۆی تەمبوورژەنی و گۆرانییەوە ماندووە. ئینجا گومان دەکا من خەوتووم، ئەوەش شتێکی باشە چونکە لانیکەم ئەمشەو بە ئاسوودەیی تێدەپەڕێ.

ویستم ئەمە بە دەنگێکی بەرز بڵێم، بەڵام دەنگم لێوە دەرنەهات. تەبەشیر بۆ ئەوەی دەنگیان دەربێ، دەبێ لە نێو پەنجەیەکدا بن و لە سەر تەختەڕەش یان دیوارێک پێیان بنووسرێ.

- ڕەشەخەونێکی ترسناکە.

من، تەبەشیرە مەزنەکەی ژێر بەتانییەکی ئەستوور، بێ ئەوەی دەنگم لێ دەربێ، وەهام بە خۆم گوت. ببوومە تەبەشیرێک کە دەیزانی چ شتێکی سەیری بەسەر هاتووە. ببوومە تەبەشیرێک کە بەسەرهاتە

خەمگینەکەی بۆ تەبەشیرێکی زەردی بچووک دەگێڕێتەوە.

باران ڕانەدەوەستا. هەر شڵپەشڵپی دەهات و بایەکی سەیریش دەستی پێکرد. با کاتێک لە خێوەتی ئێمە و لەوانی دیکەشی دەدا، لوورەی دەهات وەک ئەوەی مشاری کارەبایی لە دەوری کەمپ کار بکات. جارجارەش دەنگی وەک فیکاندنی پاسەوانی شەو کە هۆی لە دز بکات، دەهات. و کە با بەهێزتر دەبوو و لە خێوەتەکانی دەدا دەنگێک وەک بەڕەی هەڵواسراو بە بالکۆنەوەی لێ دەهات، ئەو کاتەی ژن لە گەڕەکی حەننانۆی حەڵەب بەدار دەیانتەکاند و تۆزیان لێدەکردەوە.

بیرم لە خەوتن نەدەکردەوە. هیچ دڵم بە خەوتنەوە نەبوو. تەبەشیر ناخەون و منیش بوومەتە تەبەشیر.

با هەر دەیلووراند و بە دەوری کەمپ و بە نێو خێوەتەکاندا دەگەڕا. خوشەخوشی باران بوو دەیدا بە سەربانی چادری سپیدا. لەناکاو دەرگای خێوەت بە لای ناوەوەدا کرایەوە و دوای چەند چرکە داخرایەوە و تارمایی مرۆڤێک هاتە پێش چاوم.

- خاڵۆم هاتەوە. هیوادارم نەیەت و بەتانییەکە لە سەرم لا نەدات.

فانۆسێکی بچووکی کەمشەوقی بە دەستەوە بوو. پالتۆیەکی درێژی لەبەر کردبوو و کڵاوێک سەر و

چاوی داپۆشیبوو. که لیم نزیک بووەوە بۆنی بارانی لێدەهات. ترسام. گوتم پێمدەزانێ چیم بەسەر هاتووە و نازانم که بزانێ چ دەکا.

زیاتر نزیک بووەوە و بەسەرمەوە ڕاوەستا و فانووسی هێنایە بەر دەموچاوم، دەستی گرتم بە ئارامی کڵاوەکەی لە سەری داکەند.

- مەزییەت؟

بەترسەوە وەهام گوت و بۆ خۆم سەیری دەموچاوی خڕی مەزییەتم کرد کە بزەیەکی خەمگینی لەسەر بوو.

- من مەزییەتم چۆلەکەکەم مەترسە.

بە دەنگێکی نزم ئەمەی گوت و فانووسی دانایە عەرز و هات لە لام دانیشت. نە دەمتوانی خۆم هەڵگەڕێنمەوە و نە دەشمتوانی قسە بکەم. دەمزانی کە دەنگم نابیسێ یان باشتر وایە کە بڵێم نەیدەزانی بیر لە چی دەکەمەوە. دوای ئەوەی هەندێک ترسم کەم بووەوە بە خۆمم گوت: "سەیرە مەزییەت چی دەوێ؟ چۆن خۆی گەیاندووەتە خێوەتەکەی ئێمە و ماوەی ڕابردوو لە کوێ بووە و بۆ ئێستا هاتووە؟"

- هاتووم هەواڵێکی خۆشت پێ بدەم. بە خەمی ناکەم تۆ چ بڵێی. من هێشتا تۆم خۆش دەوێ و تۆ لە هەموو ئەو پیاوە ساختەکارانەی کە شەڕ کردوونی بە بکوژ و بازرگان بە باشتر دەزانم. ئەم ماوەی ڕابردووش لە شارۆچکەی نوببل

بووم. له لای پووری دایکم بووم. ئەو بێوەژنێکی پیره که کەسی نییه. پاشان مرد و ئیدی کەسم لەم جیهانەدا نەما. به خۆمم گوت که کەمپ بۆ بێوەژنێکی وەک من له هەموو شوێنێک باشتر و هێمنتره. لەو شار و گوندانەی که ئەوان تێیدا دەبنه قوربانیی داوی پیاوان و بنێشتی سەرزاری خەڵکی، باشتره. منیش ئەم کەمپەم هەڵبژارد چون دەمزانی تۆ لێرەی.

بڕوام به چاوی خۆم نەدەکرد. ئەو دەنگی منی نەبیست، بەس دەیتوانی هزری من بخوێنێتەوه. یان مەسەلەی من و دانوستاندن سادەیه! دایکم، ئالان و خاڵۆم لێم تێدەگەن. بڵێی ئەوان تێبگەن بیر له چی دەکەمەوه!

بەڵام گەلۆ ئەمه چ هەواڵێکی خۆشه که بڕیار وایه مەزییەت به منی بدات؟ بێگومان زانیارییەکی له باوکم وەرگرتووه: زۆر جاران ئێمه بیستبوومان که له ڕەقەیه یان له دێرەزووره یان له مووسڵه. من به هیوای ئەو مامەوه که مزگێنیی له دەمی شیرینی ئەوەوه ببیسم.

- من دووگیانم کامۆ. من له تۆ دووگیان بوومه و ئێستا زگم چوار مانگانه.

و دوگـــمەی پـــاڵتۆ تەڕەکەی کـــردەوە و زگـــی هەڵماسیوی پیشانی من دا.

ئەمە چ شـەوێکە ئەی خـودای ئاسـمانان! کـابووس لە دوای کابووس! بڵێی خاڵم چ بڵێ ئەگەر ئێستا بەسـەرمدا بێ؟ مـن چـی پـێ بڵـێم و بـوونی مەزییەتـی لێـرە بە چ زمانێک بۆ شی بکەمەوە، منی تەبەشیری کەڕ و لاڵ؟

- من بێزوو دەکەم، دڵم بە تەبەشیرەوەیە.

بە بزەوە ئەمەی گوت و درێژەی پێدا:

- حەبـی کالسـیۆمم کـڕی و وەک فەرزی نـوێژ خواردم. بەڵام بێزووم بە تەبەشـیرەوە کۆتـایی نەهــات. چەنــدەم پێخۆشـــە کە تەبەشـــیرێک دەکـرتێنم و دەنگـی قرچەقرچـی لە نێـو ددانمـدا دەبیسـم. لە چانسـی خراپـی مـن لەم شـەڕەدا هەمـوو خوێنـدنگەکان دەرگاکانیـان داخسـت. ئەگەر وا نەبا، دەچـوومە دەبسـتانەکان و داوای پـارچە تەبەشـیرم لە خوێنـدکاران دەکـرد و لە بریی حەبی کالسیۆمی بێنرخ دەمخوارد.

پاشان وێنای دەنگی تەبەشیرم لە نێو ددانەکانیدا کرد:

- کررررت. کرررررررت.

و بە ئارامی بەتانییەکەی لە سەرم هەڵدایەوە. دەستی بەرەو ئەو شـوێنەی پێشـتر کێرمـی پێـوە هەڵواسـرابوو، ڕاکێشا. شتێکی درێژی وەک تەبەشـیری دەبسـتان بـوو، مەزییەت دەستی بۆ برد و هەڵیکەند. ئەری ئەو کێرمـی

کە ئەویش ببووە تەبەشیرێکی کورت، لە بندا هەڵکەند وەک ئەوەی خەیارێک لە بڕکەکەی بکاتەوە. هیچ ئازارم پێنەگەیی.

- لەگەڵ خۆم دەیبەم. لێرە تۆ هیچ کارت پێی نەماوە. جارجارە دەیکرتێنم و ئێسکی منداڵەکەی خۆتی پێ بەهێز دەکەم کامۆ. کە گەڕاشمەوە یەکسەر دەتخۆم. تەختەڕەشی برسیی مەزییەت یەکسەر قووتت دەدا ئەی چێژدارترین تەبەشیر.

مەزییەت وەهای گوت و هونەرمەندانە پێکەنی. نیگایەکی هەوەسبازانەی تێبڕیم، کڵاوە مەزنەکەی نایەوە سەری، فانووسەکەی هەڵگرت و ڕۆیی بێ ئەوەی ببینم چۆن دەرگای خێوەتەکەی کردەوە.

ئاوا ئەو ڕووداوە بە خێرایی ڕوویدا. مەزییەت لە پێش چاوم ون بوو وەک ئەوەی خەونێک بێ. لە دەرەوەش گڤەی با و شوڕەشوڕی باران هەر دەچوو زیاتر دەبوو.

***

دوای چوونەدەرەوەی ئەو ئیدی خەوم نەدەهات. نەک ئەوەی خەوم لێ حەرام بووبێ، بەڵکوو لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی سەیر ببوومە تەبەشیرێک. بۆ خۆم سەیری سووچەکانی نێو خێوەتم کرد. چاوم کەوت بەو

پشتیيانەی دایکم لە سووچێک لەسەر یەک چینبووی. وێنەکەی باوکیشم دیت. وێنە لە قاپێکدا بوو و هەڵواسرابوو. باوکم جلی عەمەلیاتی لەبەر بوو، نەشتەرێک بە دەستیەوە بوو و سەیری وێنەگرەکەی دەکرد و زردەخەنەیەکیش لە سەر لێوی بوو.

لە پێش بۆتانگازەکە هەندێک کاسەوکەوچکی لێبوو، هەموو جلەکانی ئێمەش لە بەر پێی دایکم فڕێ درابوون. دایکم زۆر ئاسوودە خەوتبوو. کاتێک دەنگی هەناسەکانی هاتە لای من کە ئاوێتەی هەناسەکانی ئالان دەبوو، هەستێکی قووڵی بەختەوەریم لە لا دروست بوو.

دوایی سەیرم کرد خاڵۆم وەک دزێک دێتە ژوورەوە. تەمبوورەکەی بە جلدە چەرمییە ڕەشەکەیەوە بە دەستیەوە بوو. بە ئارامی لە پێش نوێنەکەی خۆی داینا، کڵاو و پاڵتۆ تەڕەکەی داکەند و هۆ لەوێ فڕێی دا و خۆی کرد بە ژێر لێفەدا و دەستی بە پرخەپرخ کرد. دڵم ئاسوودە بوو کە لانیکەم ئەمشەو بەو دۆخە خراپەی من نازانێ.

چەندین کاتژمێر بۆ خۆم وەک کۆرپەیەکی تازە لەدایکبوو، سەیری نێو خێوەتم کرد. وەک ئەوەی یەکەمجار بێ ببینم لێم دەڕوانی. هەموو شتم پێ سەیر بوو. کێرمم بیر کەوتەوە کە کەمێک پێش ئێستا مەزییەت لە بندا هەڵیکەند و لە خۆمم پرسی بڵێی

بەڕاستی بیخوات؟ لە دایکمم بیستبوو کە ژنی دووگیان بیزوو دەکەن و خۆڵەمێشی جگەرە دەخۆن، گڵی دیوار دەخۆن، قوڕ دەخۆن، بەڵام تەبەشیریش؟ بڵێی ئەو کاتەی دایکم بە من دووگیان بوو، چی خواردبێ؟

هزر و خەیاڵی من لەگەڵ نزیکبوونەوەی بەربانگ و زیاتربوونی دەنگی باران، زۆرتر بوون. شریخەی برووسک و ڕەقەڕەقی هەور دەستی پێکرد. دونیا بە شەقی برووسک ڕووناک دەبووەوە. خێوەتەکەی ئێمە وەک قوببەیەکی شووشەی لێهات کە ئاگر لەسەری کرابێتەوە. بەڵام من قەت نەترسام. نە لە هەورەتریشقە و برووسک و نە لە خوشەی بارانیش. تەسلیمی چارەنووسی خۆم ببووم لەو شەوە نەفرەتلێباریوەدا و بۆ خۆم بە هیوای سبەینێ مامەوە، ئەو سبەینێیەی لەو ساتەدا هیچ هیوایەکم پێی نەبوو ئیدی.

ئیتر کە ڕۆژ بووەوە دەنگی های و هوویەکی زۆر لە دەرەوە هات. دایکم لە خەو هەستا و دەستبەجێ ڕووی کردە ئالان و لێفەکەی لەسەر لادا. ئاسوودە بوو کە هێشتا خەوتووە و گەڕایەوە درێژە بە خەوەکەی بدات، بەڵام های و هووی دەرەوە زیاتر بوو و وەک هاتوهاواری کەسانی ترساوی لێهات. دایکم لە جێکەی خۆی دانیشت و ترس نیشتە سەر ڕوخساری. دەمزانی کە دەیەوێ بانگی عەلیی برای بکات، بەڵام دڵی

نەدەهات. هەروا لە سەر جێکەی دانیشت و باوێشکی دەدا. لە دەرەوەش قەرەباڵغی بەردەوام زیاتر دەبوو.

- چ قەوماوە؟

لە ناکاو خاڵۆم لێفەکەی لە سەر خۆی لادا و هەستا هەڵاتە بەر دەرگای خێوەت کە بزانێ چییە.

- یا ستار یا ستار. خۆ کەمپەکە ئاو بردی.

ئینجا بانگی لە هەمووومان کرد:

- هەستن لافاو هەستاوە. لەیلا، کامۆ، ئالان. دە هەستن دەی.

دایکم لە جێی خۆیدا وشک بوو. پاشان بە سەر ئالاندا کە هێشتا نووستبوو، خۆی نەوی کرد و جووڵاندی تا کە خەو هەڵیستاند. ئالان چاوەکانی هەڵگلۆفی و دیسان ڕاکشا کە بخەوێ. خاڵۆم جارێکی دی بانگی کرد:

- کەمپ ئاو بردی. مەخەوە ئالان. هەستە کامۆ، هەستە یارمەتی دایکت و ئالان بکە. ئێستا لافاو دەمانبات.

کە هیچ وەڵامی لە من نەبیست، بەرەو لام هات. زانیم کە ئیدی ساتی زانینی ڕاستییەکەیە. لە جێی خۆمدا بێدەنگ و ئارام مامەوە. جا چیم بکردبا ئەگەر بێدەنگ نەبام؟ من تەبەشیرێکم و تەبەشیریش نە دەخەون و نە لە خەو هەڵدەستن و نە گوێ دەدەنە لافاو و ئاگر و نە دەشترسن. خاڵۆم هات و بە سەرمدا خۆی خوار کرد و چەند جاران بانگی کرد:

- کامۆ. کامیران.

و خێرا بەتانیی لەسەرم لادا.

چاوی پەڕییە تەوقی سەری. چەند چرکەیەک زمانی چووە بەس و دوایی بە ترسەوە قیڕاندی:

- کامیراااااان.

لەو چرکەساتەدا لافاو لە خێوەتەکەی ئێمەی دا. خاڵۆم وازی لە من هێنا و چوو بە دەم ئالانەوە. لە باوەشی گرت و بەپەلە چووە دەرەوە. دایکیشم بە دوایدا ڕۆیشت بێ ئەوەی بزانێ چ بووە. تەنانەت لە نوێنەکەمدا منی وەک تەبەشیرێکی ڕاکشاو دیت و نەشیزانی چیرۆک چییە. دیتم بە دوای خاڵۆمدا ڕۆیشت بێ ئەوەی ئاوڕێک بداتەوە.

بە تەنیا لە نێو جێکەمدا مامەوە. نەمدەزانی دەبێ چۆن هەستم. نە دەستم هەبوو، نە پێ و نە دوو باسکیش. من تەنیا ستوونێکی سپیی ڕاکشاو بوو و بە تەنیا نەمدەتوانی خۆم بجووڵێنم. دەبوا کەسێک بهاتبا و منی تل بدابا یان منی بدایەتە بەر و پاڵی پێوە بنابام یان ئەوەی لە کۆڵی کردبام.

ئاستی لافاو لە نێو خێوەتدا هەر دەچوو بەرزتر دەبووەوە. هاتوهاواری خەڵک دەهات. ژنان دەیانقیڕاند و منداڵ دەگریان:

- دونیا وێران بوو. دوام کەوە کامۆ.

دەنگێکی ناسراو هاتە گوێم. دەنگێکی خۆش کە بە ساڵان نەمبیستبوو. بە خۆمم گوت:

- مەگەر چەند ڕۆژی حەشر ڕوو دەدات. ئەوەی قەمابوو چ بوو؟

دۆخی دەرەوە بەڕاستیش وەک ڕۆژی حەشر بوو. من ژن و پیاوم دەدیت کە خۆیان بە ئاودا داوە، منداڵ و کەلوپەلەکانیشیان خستووەتە سەر شانیان. کارمەندەکانی مانگی سووریش دیت کە چۆن لە خێوەتێکەوە دەچنە یەکی دی بۆ ئەوەی منداڵ و پیر و پەککەوتە ڕزگار بکەن. ئاسەواری ئەو گووەشم دیت کە لەبەر قسەی بەرپرسە سیاسییەکە مابووەوە و و شەپۆلی لافاو لە کەمپی ژێرئاوکەتووی دوور دەخستەوە.

- دەی کامۆ دوام کەوە.

جارێکی دی دەنگە خۆشەکە هاتە گوێم. ئەوە دەنگی باوکم بوو. من بێ هیوا بووم. وەڵامم دایەوە:

- من لاقم نییە باوکە. ناتوانم هەڵبێم. لە دۆخێکی زۆر خراپدام.
- لافاو گۆچانی تۆیە کوڕم. خۆت بە لافاو بسپێرە.

هێشتا دەمویست وەڵامی بدەمەوە کە لافاو بە گوڕەگوڕی شەپۆلەکانی منی دایە بەر. سەرەتا کەوتمە سەر ئاو، بارەوبار بووم بارەوبار بووم تا کەوتمە تەک

شتەکان. بە سەر هەزاران لقی زەیتووندا تلم خوارد. دەکەوتمە بن ئاو و دیسان سەر ئاو دەکەوتمەوە و بە سەر شتی دیکەدا تلم دەخوارد.

نازانم خاڵۆم و دایکم و ئالان بۆ کوێ چوون؟ سەرم سووڕما کە هەروا جێیان هێشتم و گوێیان نەدایە دۆخی من. منیش گوێم نەدایە ئەوان. من بە خۆمەوە سەرقاڵ بووم. کەوتبووم بە کۆی ئەو شتە سەیرانەی بەسەرمدا دەهات و قەت بیرم لە دایکم و خاڵۆم و براکەم نەدەکردەوە.

بەردەوام لەگەڵ شەپۆلان دەکەوتمە بن ئاو و سەرئاو. دیمەنی ئەو لقە زەیتوونانەی سەر ئاو کەوتبوون، زۆر جوان دیار بوو. تا چاو هەتەری دەکرد لق دەبینرا. هیوام ئەوە بوو لە لقێک نزیک ببمەوە بۆ ئەوەی لەم تەنیاییە وێرانکەرەدا ئاسوودەم بکات. بەڵام لەناکاو کەوتم بە سەر تەپۆڵکەیەک گوودا.

- ئەم هەموو گووە لە کوێوە دێ؟ ئەو گووەی زیتوونی کورداخ (عەفرین و دەوروپشتی عەفرین)یان داڵدە داوە لە کوێوە دێ؟
- وڵات پڕ بووە لە گوو، گوێی مەدەیە. سەرقاڵی حاڵی خۆت بە، خۆت ڕادەستی لافاو بکە.

دیسان دەنگە خۆش و قورسەکەی باوکمم بیست.

لافاو لە کەمپ دووری خستمەوە. هەستم کرد ئیدی هێدی هێدی دەتوێمەوە.

- من له كلس دروست كراوم. كلسيش له ئاودا دەتويتەوە. من ئیستا پارچەیەک تەبەشیرم کە لافاو دەمبا. یانی دەتویمەوە! کۆتاییەکەم گەیشتووە.

بیرم له کۆتایی خۆم کردەوە.

هەستم کرد پارچەی گەورەم لێ دەبیتەوە. کەس رزگارم ناکا. تەنیام لەم ویرانییەدا. دوای ئەوەی چەندین کیلۆمەتر لافاو لەگەڵ خۆی بردمی، زۆر لەر و لاواز ببووم. باریک و لەر.

- زۆر له کەمپ دوور کەوتوومەتەوە و بێ ئەوەی خۆراگری بکەم لەگەڵ شەپۆل رۆیشتووم. هیچ گەرانەوەیەک نییە. رزگاربوونیش مومکین نییە. ئەوەی دەبێ روو بدات ئەوەیە کە هێدی هێدی بتویمەوە. واتا بمرم. بەڵی کۆتاییەکەم گەیشتووە.
- کۆتایی درۆیە کورم. کۆتایی نییە. هیچ شتێک کۆتایی نییە. نه شەر، نه مردن و نه کرێژیی مرۆڤەکان. هەبوون بێ کۆتاییە. تۆ پێت وایه کە هەبوون رۆژێک نامێنێ! نا قەت. هیچ شتێک توونا نابێ. قەت.
- یانی چۆن باوکە؟
- یانی هەبوون بازنەیەکە. هەبوونی هەموو شت له بیچمی بازنەیەکدایە. زەمان و جووڵە و

شوێن و مادده. خودی مادده، له ئەتۆمەوە بگره تا گەردوونی بێسنوور، بازنەییە. خەڵک له نێو ئەم بازنەدانە. هەر بۆیە با باوەڕت بە شتێک بە ناوی کۆتایی، نەبێ. بڕوا بە توونابوون مەهێنە.

هیچ لەو قسانەی باوکم تێنەگەیشتم. دەتوامەوە. توونا دەبـووم. بە یەکجـاری توونـا دەبـووم. دەی جـا چـۆن بـاوکم دەڵـێ توونـابوون نییە؟ توونـابوون چییە ئەگەر توانەوەی پارچە تەبەشیرێک لە ئاودا نەبێ؟

مــن توونــا دەبــم. ئەمە ئەو تــاکە ڕاســتییەیە کە لەم ســـاتەدا دەیبیـــنم بـــاوکە. کۆتـــایی مـــنە. کۆتـــایی بەسەرهاتەکەم.

٢٠١٩/٠٢/١٨